**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب کارە ساتی هەکاری

نوسینی نەوشیروان مستەفا

بابەت مێژو

چاپی یەکەم حوزەیرانی ١٩٨١

چاپی دوەم ئابی ١٩٨٣

چاپی سێیەم حوزەیرانی ١٩٩٥

چاپی چوارهەم ٢٠١١

**نرخی ٤٠٠٠ هەزاردیناری چاپی نوێیە**

**لەلایەن کتێبخانەی شەهید جەمالی عەلی باپیرەوەچاپکراوەتەوە**

# ناوەرۆك



★ کۆنەپەرستانی ئێران، تورکیا، عیراق و (ق.م) پیلان ئەگرن دژی شۆڕشی پیرۆزی گەلەکەمان.

★ چەتە کورد کوژەکانی بەرزانی دواپەردە لەسەر دەوری خائینانەی خۆیان لائەدەن.

# پێشەکی

لەم ماوەیەدا ٣ ساڵ تێنەپەڕی بەسەر کارەساتەکەی هەکاریدا لەماوەی چەند ساڵ تەمەنی شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا، هیچ ڕووداوێك ئەوەندەی کارەساتەکەی هاوینی ٧٨ی هەکاری مشتومڕی لێ پەیدا نەبووەو باسی نەکراوەو برین و شوێنەواری بەجێ نەهێشتووە، ئەوەندەی ئەو زەرەری لەشۆڕشی کوردستانی عیراق و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان نەداوە، وە ئەوەندەی ئەو دژی (ی.ن.ك) و ڕێبازە سیاسی و پێشمەگەییەکەی و دژی سەرکردەو لێپرسراوو کادرو پێشمەرگەکانی، تەنانەت دژی شەهیدە سەروەرەکانیشی بەکار نەهێنراوە.

لەڕاستیدا کارەساتەکەی هەکاری ڕووداوێکی گەورەیە لەمێژوو گەلەکەمانداو شایستەی ئەوەیە دەیان کۆڕی لێکۆڵینەوەی بۆ ببەسترێت و دەیان وتارو کتێبی لەسەر بنووسرێ و دەرس و پەندو ئەنجامی لێ دەربهێنرێ و هەرگیز لەبیر نەچێتەوە.

کارەساتەکەی هەکاری ئەوساکە کارێکی وەهای کردە سەر شۆڕش و هێزە چەکدارو ڕێکخراوە سیاسییەکانی، کە دوژمن وای ئەزانی گورزێکی کوشندەی وای لێداون ئیتر خۆیان نەگرنەوە، هەلپەرست و داخ

لەدڵەکان کەوتنە هەوڵدانی قۆستنەوەی هەلی روازی، دوو دڵ و راراکان بەزین و مەیدانیان چۆڵ کرد، تێکۆشەرە دڵسۆزەکانی گەلەکەشمان سەرەڕای هەلومەرجی سەخت و دژوار بازووی خەباتی شۆڕشگێڕانەیان لێ هەڵماڵی و کەوتنە بیناکردنەوەی کەلاوە رووخاوەکان و هەڵساندنەوەی باری کەوتووی شۆڕش.

زۆری نەخایاند برینەکان سارێژ بوونەوە، بەپێچەوانەی چاوەڕێی دوژمن و ناحەزەوە، بەپێچەوانەی ویست و ئارەزووی هەلپەرست و داخ لەدڵەکانەوە، بەپێچەوانەی بۆچوونی رارا بەزیوەکانەوە.. کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان پشتیان نەکردە (ی.ن.ك) و هێزی پێشمەرگە، شۆڕش هەستایەوە.

*بەڵام لەئەنجامی کارەساتەکەی هەکاریدا (ی.ن.ك) دەیان سەرکردەو کادری سیاسی و پێشمەرگەی هەڵکەوتوو و سەدان پێشمەرگەی دلێرو ئازای لەدەستدا، دەیانیان شەهیدو برینداربوون، دەیانیان گیران و دوورخرانەوە، سەدان پارچە چەکی فەوتا.

بێگومان زەرەرکەوتن لە (ی.ن.ك) کە ئەو سا تەنیا هێزی شۆڕشگێڕی سەر مەیدانی شۆڕشی کوردستان بوو، زەرەرێکی گەورە بوو لەجوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان.

*هەر لەئەنجامی ئەمەدا بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان دوو رابەری مەزنی خۆی و دوو سەرکردەی گەلەکەمانی لەکیست چوو، کە

بووەهۆی ئەوەی باڵی هەلپەرست و راستڕەوی ناو سەرکردایەتییەکەی رێگەی بۆ تەخت بێت بەئارەزووی خۆی بزووتنەوە بەکاربهێنێ بۆ ئاژاوەنانەوە لەناو ریزەکانی (ی.ن.ك) و هێزی پێشمەرگەو شۆڕش داو دوایی تر بۆ جیابوونەوەو لەت و پەتکردنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان*.

*هەر لەئەنجامی ئەم کارەساتەدا دەلاقەی بەینی (ی.ن.ك) و (ق.م) قووڵترو فراوانتر بوو، (ق.م) بەئاشکراو بەبێ پەردە دەستی لەگەڵ دوژمنانی نەتەوەو نیشتماندا بۆ لەناوبردنی (ی.ن.ك) تێکەڵاو کردو خیانەتێکی زلی مێژوویی کردو زەرەرێکی گەورەی هەم لە (ی.ن.ك) و هەم لەجوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان دا، بەوەی کە ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ یەکێتیدا قووڵترو توندوتیژترو خوێناوی تر کرد بەجۆرێکی ئەوتۆ کە چارەسەرکردنی ئاڵۆزترو دژوارتر بوون، وە ئەوە

---

*لەنامەیەکدا کە سامی دەربارەی گیرانی سەرکردەکانی بزووتنەوەی لەلایەن ق.م ەوە، ئەو کاتە بەتایبەتی بۆ رەسوڵ مامەندی نووسیوە، ئەڵێ گیرانی ئەوانە بۆ ئەوەیە ی.ن.ك لەدەسەلاتی جەلالیان دەربێت و باڵەکانی ناو یەکێتی سەربەخۆیی خۆیان بەکاربهێنن.

رەسوڵ مامەندیش لەوەلامی ئەو نامەیەدا تەئیید رەئییەکەی سامی کردووە کەوا: گیران و گلدانەوەی ئەوانە بووتەهۆی کەمبوونەوەی دەسەلاتی جەلالیان و زیادبوونی سەربەخۆیی بزووتنەوە لەوەرگرتنی هەڵوێست داو بەژێرزارەکی پێخۆشحاڵی خۆی دەبریوە بەم بۆنەیەوە.

چەند ساڵە (ق.م) لەکوردستانی عیراقدا بۆتەهۆی هەڵگیرساندنی شەڕێکی لاوەکی و ناوخۆو خەریککردنی هێزی پیشمەرگە لەپارچەکانی تری کوردستانیشدا ببۆتە دڕکی سەر ڕێگەی هێزە شۆڕشگێڕان.

*هەر لەئەنجامی ئەم کارەساتەدا رژێمی فاشی عیراق توانی بەئاسانی و بێ ئەوەی تووشی بەرگرییەکانی کاریگەر ببێت هەموو ناوچەکانی سنوور رابگوێزێ و دانیشتووانی گوندەکانی سنوور لەئۆردوگای زۆرەملێدا کۆبکاتەوە، چونکە چەك و تفاقی جەنگییان پێ نەگەیشت و ناوچەکانیش بەشی رابەریکردنی راپەڕینی وەها پێشمەرگەیان تیا نەمابوو، ئەمە جگە لەوەی خەڵکەکە بەهۆی ئەو شکستییە کاریگەرەوە ساردبوونەوەو ئومێدیان بەسەرکەوتنی شۆڕش کز بوو.

*هەر لەئەنجامی ئەم کارەساتەدا بادینان، پارچەیەکی گرنگی کوردستانی عیراق، وەکو قەڵەمڕەوێکی داخراو بۆ هێزە کۆنەپەرستەکانی کوردو فاشستەکانی عیراق مایەوەو چالاکی شۆڕگێڕانەی سیاسی و چەکداری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان پێ نەگەیشت، جا هەر لەوێ وەکو پێویست هێزەکانی شۆڕش نەگەشانەوە، هەروەها تەوقی ئەو ئابلۆقەیەی دەوڵەت و هێزە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکەش لەدەوری شۆڕش گیرابوویان، وەکو پێویست نەشکاو ڕێگاو پردی پەیوەندیی لەگەڵ دونیای دەرەوە بەچاکی دانەمەزراو شۆڕش بێبەش بوو لەپشتیوانی و لایەنگری هێزە پێشکەوتووەکانی دەرەوە.

ئەمانە هەندێکن لەو زەرەرە گەورانەی کارەساتەکەی هەکاری لەشۆڕشی کوردستانی عیراقدا، ئێستاش لەدوای تێپەڕبوونی ۳ ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا هێشتا شوێنەوارەکانی بەتەواوی نەسڕاونەتەوە.

ئەم وتارەی لێرەدا پێشکەش ئەکرێ، بەری هەڵسانگاندنی دەیان راپۆرت و بەراوردکردنی گێڕانەوەی دەیان کادرو پێشمەرگەیە کە خۆیان لە کارەساتەکەدا بەشداربوون، بەهۆی ئەوەی هەندێ راستی شاردراوەی روون کردبێتەوەو هەڵەو کەموکوڕییەکانی ببنە دەرسی سیاسی و تەجروبەی پێشمەرگانە.

بێگومان رۆژێك دێ هەموو بەڵگە نهێنییەکانی ئەم پیلانە تاوانکارانەیە ئەکەوێنە روو کە دژی (ی.ن.ك) بەتایبەتی و دژی گەلەکەمان بەتێکڕا سازکرا.

وە رۆژێکیش دێ پەیکەری سەروەریی شەهیدە نەمرەکانی کارەساتی هەکاری، وەکو رەمزی گیانبازی قارەمانانەیان لەپێناوی کوردو کوردستاندا لەمەیدان و شەقامە گیشتییەکاندا بەرز دەکرێتەوە.

نەوشیروان مستەفا
ناوزەنگ
۱۹۸/٤/۳۰

خولی دووەمی کۆبوونەوەکانی ك.س – (ی.ن.ك) چەندین مەسەلە گرنگی سیاسی، پێشمەرگەیی، ئیعلامی، رێکخراوەیی، دارایی لەبەردەمدا بوو کە ئەبو لێیان بدوێ و باسیان بکات و بڕیاریان لەسە بدات، لەناو ئەو مەسەلانەدا مەسەلەی دیاریکردنی ناوچەی بنکە بارەگاکانی دەزگا سەرکردەییەکانی شۆڕش کە ببێتە ناوەندی رابەرایەتی چالاکی پێشمەرگەیی و سیاسی و ئیعلامی شۆڕش شوێنی پێکەوەگرێدان و پەیوەندی هێزو هەرێم و لقە جیاجیاکان.

ك.س ((ی.ن.ك)) بەگشتی بڕیاریدا کە بارەگاو بنکەکانی دەزگ سەرکردەییەکانی شۆڕش بگوێزرێتەوە شوێنەکانی ساڵی پێشوو لەناوچەی برادۆست، کە ئەکەوێتە ناوچەی ٣ سنووری عیراق-ئێران-تورکیاوە لەبەر زۆری ئیعتباری نەتەوەیی، سیاسی، جەنگی، تاکتیکی.

ناوچەی ٣ سنوور ئەو کاتە گرنگیەکی گەورەو بەتایبەتی هەبوو لەچاو شوێنەکانی تری کوردستانی عیراقدا چونکە:

٣ دەوڵەتی عیراق، ئێران، تورکیاوە لە٣ پارچەی جیاجیای کوردستان پێکەوە گرێ ئەدات و ناوچەکانی بادینانی عیراق و سۆرانی عیراق بەیەکەوە ئەبەستێت، هەروەکو توانای هێنانی ئازووقەو کەلوپەلی

پێویست لەگەڵ دەوڵەتی جیاوازەوە هەیەو ئەبلۆقەدانی ئابووری دژوارە، سەرەڕای ئەوەی کە ناوچەکەش شاخاوی و سەخت و عاسییەو دوژمن ناتوانێ لەهەموو لایەکەوە ئابلۆقەی سوپایی بدات و بەئاسانی نایگاتێ و ناوێرێ بچێتە ناویەوە.

جگە لەمانە هەمووی، لەبەرئەوەی کە بەهارو هاوین و پاییزی ١٩٧٧ بارەگای سەرکردایەتی (ی.ن.ك) و هێزی گەورەی پێشمەرگە لەوێ بووبوو، وە زستانەکەی لەبەر نەتوانینی تەئمینکردنی پارەی ئازووقەی هێزوبارەگاکانیان کشابونەوە ناوچەکانی هەولێروسلێمانی ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەکانی کادیرە پێشمەرگەیی و سیاسی و پێشمەرگەکانی شارەزاییەکی باشیان لە هەر ٢ دیوەکەی سنور هەبو.

ك.س – (ی.ن.ك) بەگشتی بڕیاریدا کە بارەگای سەرکردایەتی بباتەو
ناوچەی برادۆست لەسەر ٣سنوور بۆ ئەوەی:
١-بارەگای دەزگا سەرکردەییەکان لەشوێنێکی ئەمیندا جێگیر بیێ و
بپەرژێتە سەر جێبەجێکردنی ئەرك و فرمانەکان.
٢-پێش ١٩٧٨/٦/١ واتە پێش کاتی جێبەجێکردنی بڕیاری
حکومەتی عیراق لەمەڕ راگوێزانی دیهاتەکانی سنوور، رێگەی
پەیوەندیی لەگەڵ دنیای دەرەوە، وە رێگەی هێنانی تفاقی جەنگی و
یارمەتی و پێویستییەکانی شۆڕش بکاتەوە.
٣-مەفرەزەکانی بادینان لەوێوە بنێرنەوە بادینان و جێگریان بکەن و
لەوێوە هێزی پێشمەرگە شەپۆل بەشەپۆل بەرەو قوڵایی بادینان بچێ و
گڵپەی شۆڕش هەڵبگیرسێنێ بەتایبەتی لەدوای ئەوجەزرەبە قورسانەی
ساڵانی ٩٧٦-٩٧٧ لەلایەن (ق.م)-ەوە لەهێزەکانی (ی.ن.ك) درابوو.
٤-پاککردنەوەی ناوچەکە لەچەکدارەکانی پ.م ئەگەر بوونە رێگری
لانەکەی (ی.ن.ك)

٥-داواییەك لەسەر یەكی دۆستەكانی (ی.ن.ك) لەتوركیا بەتایبەتی (دە،دە،كا،دە- DDKD)* بۆ نزیكبوونەوەی هێزەكانی (ی.ن.ك) لەسنووری توركیا.

بۆ جێبەجێكردنی ئەم ئامانجانە ك.س- (ی.ن.ك) بڕیاریدا:

١-زانیاری تەواو لەسەر ناوچەكە كۆبكاتەوە، بەتایبەتی ئەو ئالوگۆڕانەی بەسەر هێزەكانی دوژمناندا لەناوچەكەدا هاتوون.

٢-هێزێكی ئەوتۆ سازبدات بۆ ئەوەی بەرەو شوێنی دیاریكراو بەرێبكەوێ و بەشی جێبەجێكردنی پلانەكەی یەكێتی بكات.

٣-شوێنی جێگیربوونی هێزەكانی (ی.ن.ك) لەدوا قۆناغدا، واتە لەناوچەی برادۆستدا قایم بكات.

---

* (دە،دە،كا،دە- DDKD) كورتكراوەی ناوی رێكخراوێكی ئاشكرای كوردستانی توركیایە، كە حیزبێكی سیاسی لەپشتییەتی و تائێستا ئەو حزبە چەند جارێك ناوی خۆی گۆڕیوە، بەلاّم ناحەزەكانی و پۆلیسی تورك بەشفانچی ناویان ئەبەن، چونكە حزبەكە خۆی بەدێژەكێشانی ئەو باڵەی پارتی دیموكراتی كوردستانی توركیا دائەنێ كە شەهید دكتۆر شفان رابەری ئەكرد.

سەرکردایەتی (ی.ن.ك) کەوتە کۆکردنەوەی زانیاری و دەنگوباسی پێویست لەچەند سەرچاوەیەکی سەرەکی و لاوەکی جیاجیاوە لەوانە:

١-دە، دە، کا، دە.

٢-ئەوانەی لەلای (ق.م)-ەوە رایان ئەکردو ئەهاتنە ریزی (ی.ن.ك)-ەوە.

٣-ئەو کادرو دۆستانەی (ی.ن.ك) لەناوچەکانی (ق.م)-دا هەیبوون.

٤-ئەو پێشمەرگانەی (ی.ن.ك) کە لەلایەن (ق.م) گیرابوون.

ئەم زانیاریانەی لەو چەرداوانەوە هاتن لەسەر هێزە چەکدارەکانی (ق.م)، ژمارەیان، جۆری چەکەکانیان، لێپرسراوەکانیان، بارەگاکانیان، وزەی جەنگاوەرانەیان، تواناو ئیمکانیاتی سیاسییان، پشتیوانیان لەناو عەشیرەتەکانی سەر سنووردا، لەیەك دران، هەروەها ئەو زانیارییانەی لەسەر هێزەکانی عیراق و تورکیا کۆکرابوونەوە هەڵسەنگێندران، ئەنجامەکانی ئەم چەشنە بوو:

*هێزە چەکدارەکانی حکومەتی عیراق

گۆڕینی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتبوو، وە هەر لەشوێنەکانی ساڵی پێشوو بوون، واتە لەسەربازگەو نوقتەو رەبیەکانی کۆنی خۆیاندا بوون، لەناوچەکانی چۆمان، برادۆست، مێرگەسوور.

*هێزە چەکدارەکانی حکومەتی تورك:

قەرەقولەکانی سەرنوور، دائمی و موئەقەتەکان، ئەوانەی زستانە لەشوێنی خۆیان بوون و ئەوانەی هاوینە هێشتا نەهاتبوونەوە شوێنەکانی خۆیان لەناوچەکانی گەورە، شەمزینان، چەلی...

*هێزە چەکدارەکانی حکومەتی ئێران:

پاسگاو پەیگاو پادگانەکان لەشوێنەکانی خۆیاندا بوون و ئاڵوگۆڕێکی گرنگیان بەسەردا نە هاتبو لەناوچەکانی سەردەشت، خانە، شنۆ...

*هێزە چەکدارەکانی (ق.م):

بارەگاکانیان، گوستە، چەرمەتۆ، هەرکی، شەکنوس، پیداو، لێپرسراوەکانیان: سامی، ئەورەحمان، بیداوی، ئازاد مەحمود خەفاف، وریا رەئوف سەعاتچی، ئازاد بەرواری، غازی زێباری، کەریم سنجاری، جەوهەر نامق، کەماڵ کەرکوکی، ملازم سەردار ئەبو بەکر، ملازم عومەر عوسمان، عەریف یاسین، مستەفا نیروەیی، نهاد، یونس رۆژبەیانی، حەمید ئەفەندی، عبداللە صالح، هاشم رەمەزان، مەلا ئەمینی بەرزانی. ژمارەی هێزی ئەسڵیان ٢٥٠-٣٠٠ چەکدارە.

*هێزە چەکدارەکانی (ق.م) لەچەندین بارەگاو بنکەی دوورو لەیەك دابڕاودا لەهێڵێکی درێژی سنووری تورکیا-عیراقدا پەرت و بڵاوبوون و هیچ بارەگایەکیان لە٣٠-٥٠ کەس زۆرتری تیا نەبوو.

*هێزو چەکدارەکانی (ق.م) لەڕووی چۆنایەتی سیاسی و سوپاییەوە پێکەوە نەگونجاوو نارێك و پێکبوون، هەندێکیان خوێندەواریی شار بوون لەئەوروپاوە گەڕابوونەوە وەکو سامی و ئازاد خەفاف و وریا سەعاتچی.. وە هەندێکیان پیاوی بنەماڵەی بەرزانی بوون و لەئێرانەوە نێردرابوونەوە وەکو عەریف یاسین و حەمید ئەفەندی و یونس رۆژبەیانی... وە هەندێکیان خەڵکی دێهاتەکانی سنوورو هەندێکی تریان خەڵکی ناو تورکیا بوون.

*دەدەدە،کادە وای ئیدیعای ئەکرد کە (ق.م) لەناو چەند سەرۆك عەشیرەتێکی کۆنەپەرستدا لەجەلی ئولودەرە نفوزو دەسەڵاتی هەیە، وە دەدەدە،کادە خۆی لەناو هۆزو خێڵەکانی شەمزینان و سەرانسەری هەکاریدا نفوزو دەسەڵاتی هەیەو لەکاتی گەیشتنی هێزی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) دا ئەوان هاوکاری سیاسی و جەنگی یەکیەتی ئەکەن..

لەئەنجامی بەراوردو تاووتوێکردنی ئەو زانیارییانەی ك.س- (ی.ن.ك) بڕیاری دا هێزێکی تێکەڵاوی چەکدارو بێچەك لەپێشمەرگەی زۆربەی هەرێمی کوردستانی عیراق سازبدات و بەڕێی بکات کە:

١-بەشێکی هێزەکە بۆ پاراستنی بنکەکانی م.س و م.ع-(ی.ن.ك) لەبرادۆست بمێننەوە.

٢-بەشێکی تری دوای پڕ چەککردنی بەچەکی زیادەوە بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان.

٣-مەفرەزەکانی بادینان لەگەڵ هێزێکی پشتیوانی و یارمەتیدەردا بچنە بادینان.

بەم جۆرە (ی.ن.ك) هێزێکی گەورەی سازدا کە نزیکەی ١٠٠٠ پێشمەرگە ئەبوو لەچەکدارو بێچەك، لەخەڵکی ناوچەکانی سەرانسەری کوردستانی عیراق هەر لەخانەقینەوە تا زاخۆ لەگەڵ زۆرایەتی ئەندامانی ك.س و ژمارەیەکی زۆر لەفەرماندەی هەرێم و کەرت و مەفرەزەکان و کادیرە سیاسییەکان. کە بکەونەڕێ.

---

بڕیار درا ئەو هێزە گەورەیە ببێتە ٣ بەش.

هەر بەشێکیان چەند لێپرسراوێکی لەگەڵ بێت، هەندێکی چەکدارو هەندێکی بێ چەك بێت، خۆی ئازاد بێت لەهەڵبژاردنی ئەو ڕێگایەدا کە ئەیگرێتەبەرو بەو مەرجەی لەکات و شوێنی دیاریکراوا ئامادەبێت، وە خۆی وەکو هێزێکی سەربەخۆو بەرپرسی دۆزینەوەی ڕێگاو شارەزاو تەئمینکردنی ئازووقەو زەخیرەو وڵاغ بێت.

## بەشی یەکەمی هێزەکە

٢٢٠ پێشمەرگە زیاتر بوو لەوانە ١٥٠ چەکدارو ئەوی تریان بێ چەك بوون.

ئەو لێپرسراوانەی لەگەڵ هێزەکە بوون: خالید سەعید، (ئەندانی م.ع-(ی.ن.ك)) حسین بابە شێخ (ف.هـ پێنجوێن)، حامید حاجی غالی (یاریدەدەری ف.هـ١ی هەورامان و شارەزوور).

ئەم هێزە ئەبوایە لە١٩٧٨/٤/١٩دا لەناوچەی قەڵادزەوە بکەوێتەڕێ و لەسەرەتای مایسدا لەناوچەی برادۆست بێ.

## بەشی دووەمی هێزەکە

نزیکەی ٥٠٠ پێشمەرگە ئەبوو کە لەوانەی نزیکەی ١٥٠ کەسیان بێ چەك بوون.

ئەو لێپرسراوانەی ئەبوو لەگەڵ هێزەکە بن: عەلی عەسکەری (ف.هـ.پ.ك)، تایەری عەلی والی (ئەندامی م.س و م.ع-(ی.ن.ك)) سەید

کاکە (فـەی هەولێر)، تالیب رۆستەم (فـ٦ی قەلادزە)، شـ
جەوادی بیدەری (یاریدەدەری فـە٦چەمی ریزان).

ئەم هێزە ئەبوایە لە١٩٧٨/٤/٢١دا واتە دوو رۆژ دوای جولانی بەشـ
یەکەم لەناوچەی قەلادزەوە بکەوێتە رێ و لەسەرەتای مانگی مایسـ
لەگەڵ بەشی یەکەمی هێزەکە لەبرادۆست یەك بگرێتەوە.

بەشی سێیەمی هێزەکە

نزیکەی ١٥٠ کەس بوو کە زۆربەیان چەکدار بوون، وە ئەبوا
سکرتێری گشتی (ی.ن.ك) و ئەندامانی تری م.س-(ی.ن.ك) و نوێنەر
کۆمیتەی ئامادەکردنی پ.د.ك و پاسۆکی لەگەڵ بوایە.

ئەبوایە ئەم هێزە لە ١٩٧٨/٤/٢٧ بکەوتایەتە رێ لەقەندیل
چاوەڕوانی هەواڵی یەکگرتنەوەی بەشی یەکەم و دووەمی هێزەکە
برادۆستی بکردایەو ئینجا ئەویش بەرێ بکەوتایە بەرەو برادۆست.

جگە لەم هێزانەی بەرێ ئەکران بەرەو برادۆست، لەسنووری هەر
هەرێمێکدا چەند مەفرەزە یاخود کەرت، وە فەرماندەی هەرێمەکە، یاخود
یاریدەدەرەکەی گل ئەدرایەوە، بۆ ئەوەی ناوچەکە لەو ماوە یەدا چۆڵ
نەبێت و بۆشاییەکی سوپایی و سیاسی دروست نەبێت.

ئەم هێزانە چەکەکانیان بریتیبوو لە کلاشنکۆف، برنەو، هەندێ
رەشاشی برنەو، وە چەند دانەیەك ئار، بی.جی.

ئەم هێزانەو لێپرسراوەکانیان لەڕووی سیاسی و پێشمەرگەییەوە ز
ڕێك و تەبا بوون، جگە لەو ناکۆکیانە لەنێوان باڵە جیاوازەکانی
(ی.ن.ك) دا هەبوو، هەندێ ناکۆکی توندوتیژ لەناو سەرکردایە؛
ب.س.ك دا هەبوو، بەتایبەتی لەسەر مەسەلەی بە عیراقی کردنی شۆڕش
هەڵگرتن یا داگرتنی دروشمی ڕوخاندنی ڕژێمی عیراق، پاککردنەوەی
کوردستان لەپاشماوەی چەکدارەکانی (ق.م).

مەسەلەی پاککردنەوەی کوردستان لەچەکدارەکانی (ق.م) وە یاخو
(هدنە)کردنی لەگەڵیان و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی شێوەیەکی هێمن
پێکەوە ژیان، دیسانەوە هاتەوە کایەو هەندێك لەسەرکردایەتی ب.س.ك
کەوتنە لێدانەوەی ئەو باڵەوەیە کە بێگومان لەو کاتە گرنگەدا دوو دڵی
و ڕاڕایی لەناو هێزەکاندا دروست ئەکردو گیانی جەنگاوەرانەو
دەستەوەشاندنی لەپێشمەرگەکاندا ئەمراند، ئەو قسەو باسانەی
لەکۆبوونەوەکاندا ئەکرا زۆر جار لەناو پێشمەرگەکانیشدا دەنگی
ئەدایەوە.

یەك دڵی لەهەڵوێستی سیاسی هێزەکەدا لەڕووی دیاریکردنی دۆست
و دوژمنەوە، وە یەك دەستی هەڵوێستی سوپایی هێزەکە لەڕووی لێدانی

بێ چەندوچوونی دوژمنانەوە کە شتێکی پێویست بوو، دیسانەوە خرایە سەر مێزی لێدوان و گفتوگۆو باسکردنەوە، دوو دڵی و رارایی لەلێدانی (ق.م)-دا جارێکی تر لەدڵی هەندێکدا شین بووەوە، تەنانەت لەناو ئەندامانی م.س-(ی.ن.ك) دا هەبوو رەئی وابوو کە بۆ ئەوەی (ی.ن.ك) بتوانێ بێ گێرمەو کێشە رێگەی هێنانی چەك بکاتەوەو ماوەی خەڵك چەکدارکردنی هەبێت لەگەڵ (ق.م) رێکبکەوێ و نیسبەتێکی ئەو چەکانە ئەیهێنێ لەباتی (گومرگ)و (باج) بیدات بەوان.

پاشماوەی ئەندامانی ك.س-(ی.ن.ك) دیسانەوە چەند جارێ: کۆبوونەوە بۆ دیاریکردنی هەڵوێستێکی نوێ لە (ق.م) بەتایبەتی دوای ئەوەی ئیدریس یەك دوو کەسی (ساواك)ی راسپاردبوو بەناو بۆ گفتوگۆی رێککەوتن و لەڕاستیدا بۆ کۆکردنەوەی دەنگوباس و بۆ خاوکردنەوەو پیلان گێڕان.

بەر لەبەرپێکەوتنی هیچ کام لەو ٣ بەشانەی هێزەکە لەئەنجامی ئەو کۆبوونەوانەدا ك.س- (ی.ن.ك) بڕیاریدا کە ئەم هەڵوێستە بەرامبەر (ق.م) بگرێ بۆ ئەوەی سەرکردایەتی هێزەکە پەیڕەوی بکات:

١-هێزەکانی (ی.ن.ك) لەهەموو حاڵەتێکدا بچنە ناوەڕاستی برادۆست.

٢-ئەگەر هێزەکانی (ق.م) بەبێ شەڕپارەگاکانی ساڵی پێشووی (ی.ن.ك) یان چۆڵ کرد، وا بەدوویان نەکەون و وازیان لێبهێنن.

٣-ئەگەر چەکدارەکانی (ق.م) هاتنەسەر ڕێگەی هێزەکانی (ی.ن.ك) وا بەتوندی لێیان بدرێت.

بەنیازی خۆلادان لەشەڕی (ق.م) و خارکردنەوەی گرژیی نێوان (ی.ن.ك) و ئەوان چەند نامەیەك لەلایەنی سەرکردەو لێپرسراوەکانی (ی.ن.ك)-ەوە نووسرا بۆ هەندێك لەگەورەکانی بنەماڵەی بەرزانی لەوانە:

*مام جەلال و عەلی عەسکەری نامەیان نووسی بۆ شێخ محەمەد خالدی بەرزانی.

*خالید سەعید نامەی نووسی بۆ دایکی مەسعود بارزانی.

*تایەری عەلی والی نامەی نووسی بۆ ڕەشید سندی.

ناوەرۆکی ئەم نامانە بریتیبوو لەوەی کەوا:

کوردستان لەمەترسی راگوێزان و بەعەرەبکردن دایەو کورد لەمەترسی لەناوچوون و تەفروتوناکردنی دایە، بۆیە ئەبێ کورد هەمووی یەك بکرێ بۆ لەگژداچوونەوەی دوژمنی سەرەکی کە حکومەتی عیراقە، وە ئەو هێزە بەرەو بادینان ئەکەوێتە رێ بۆ ئەوەی کە هەرچی زووتر رێگەی چەك بکاتەوەو فریای دانیشتوانی ناوچەکانی سنوور بکەوێ پێش ١٩٧٨/٦/١ کە کاتی دەستپێکردنی راگوێزانیانە، وە هێزەکە نیازی پەلاماردانی (ق.م)-ی نییە بەڵکو بۆ ئەو ئامانجە پیرۆزەی ئەچێ و ئەوانیش نفوزی خۆیان لەلای مەلا مستەفاو کوڕەکانی و پیاوەکانی بەکاربهێنن بۆ ئەوەی نەبنە رێگری هێزی پێشمەرگە لەبادینان و سنووری تورکیاو شەڕ بەهێزەکانی (ی.ن.ك) نەفرۆشن.

ئەم نامانە بەڕاسپێردراوەکانی ئیدریشدا نێردران بۆ تاران و کەرەج و گەیشتنە دەست خاوەنەکانی.

نووسین و ناردنی ئەم نامانە، رادەی دوودڵی سەرکردایەتیی (ی.ن.ك) دەرئەخا لەمەسەلەی لێدانی (ق.م) دا، جا دوودڵی و رارایی لەبڕیاردانی جەنگیدا بەتایبەت لەکاتی ناسکدا دەردێکی کوشندەیەو دوژمن ئەتوانێ بەچاکترین شێوە کەڵکی لێوەربگرێت.

لەکاتێکدا سەرکردەکانی (ق.م) کە هەموو چەکدارو دەست و لایەنگرەکانی خۆیان بەگیانی دوژمنایەتییەکی سەخت و بێ ئەندازەی

(ی.ن.ك) پەروەردە کردبوو، بۆ ئەوەی کە بێ سێ و دوو لەهەوڕیا ڕاپەڕستن و بەگژیا بچن و ئەگەر بتوانن (ی.ن.ك) وەکو هێزێکی دوژمن بەخۆیان لەڕەگ و ریشەوە دەربهێنن، کەچی گومان و دوودڵی و ڕارایی خرابوو ناو هێزەکانی (ی.ن.ك) کە ئاخۆ ئەو شەڕە بکرێت، یان نەکرێ باشە؟ وە ئەو شەڕە براکوژییە یان شەڕی براکوژی نییە؟ (ق.م) لەیەکێتی نادەن ئیتر بۆچی یەکێتی لەوان بدات؟

هێزەکانی (ی.ن.ك) خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەوەی بەرەو ئامانجی دیاریکراو بکەونەڕێ، لەبەرگەورەیی هێزەکەو زۆر باسکردن و زۆر مانەوە مەسەلەی پاراستنی نهێنی بەڕێکەوتن و ڕێگەکەی و ئیتجاهی و دوا قۆناغی، هەروەها مەسەلەی ئامانجی بەڕێکردنی ئەو هێزە لەلای هەموو دوژمنەکانی (ی.ن.ك) چ حکومەتی عیراق و ئێران، تورکیاوە چ (ق.م) دیارو ئاشکرابوو.

بەشی یەکەمی هێزەکە، لەکاتی دیاریکراوی خۆیا واتە لە١٩٧٨/٤/١٩ لە(گورەشێر)ەوە بەدیوی ئێراندا سنووراو سنوور کەوتەڕێ، ناوچەی سەردەشت و بەشێکی خانە (پیرانشەهر)یان بڕی و لەنزیك حاجی ئۆمەرانەوە ئاودیوی عیراق بوونەوەو لەئالانە- گوندەڕۆژ، گرتك و ڕوست- هردین- بیرکەوە گەیشتنەوە برادۆست.

لەبەرئەوەی هێشتا هێزەکانی دوژمن بەتەواوی بەخۆنەکەوتبوو، ئەو هێزە تووشی شەڕو برسێتی و سەرما نەبوو، گیروگرفت و ناڕەحەتی زۆریان نەهاتەرێگا، بەلام هێزەکانی دوژمنی هۆشیارکردەوە کە هەرچی زووتر بکەونە خۆئامادەکردن بۆ ڕێگەگرتن و لێدانی هێزەکانی تری یەکیەتی.

بەشی دووەمی هێزەکە بەهیوای ئەوەی سوود لەچاوپۆشینی حکومەتی ئێران لەهاتوچۆی کەمی پێشمەرگە وەربگرێ، خۆی دواخست و بەتەمای ئەوەبوو کە بەئۆتۆمبیل بەناو ئێراندا لەجادەی سەردەشت –پیرانشەهر- شنۆوە بڕوات و لەنزیك کیلەشین* دابەزێ و لەوێوە ئاودیوی عیراق بیێ و بچێتە ناوچەی برادۆست.

سەرکردایەتی هێزەکە چەند کەسێکی نارد بۆ دیوی ئێران بۆ ئامادەکردن و بەکرێگرتنی ئۆتۆمبیلی پیکاب، زانیاری پێویست لەسەر ژمارەو لێپرساوو چەکەکانی ئیتجاهی رۆشتنی گەیشتەوە ساواك و ئەرتەشی ئێرانەوە پاش ئەوەی نائومێد بوو لە (بەئۆتۆمبیل رۆیشتن)

---

* بەئۆتۆمبیل رۆیشتن بەناو ئێراندا پێشنیاری تایەری عەلی والی بوو، کە لەناو پێشمەرگەدا ناسراوە بەتەمەڵی و توپۆیی، جگە لەسەرکردایەتی هێزەکە دکتۆر مەحمود شەمسەدین مفتیش ئاگاداری ئەم بڕیارە بوون، تەنانەت شەمسەدین مفتی کە هەر ئەو کاتە گوایە بەئیش و کاری (لجنة تحضيري) لەئێرانەوە سەفەری دەرەوەی وڵاتی کردو دوایی تر هەر لەدەرەوە تەسلیمی عیراق بووەوە، ئەوکاتە ئەویش لەگەڵ هەمان کابرادا چوو بۆ ئێران، کە ئەبوو ئۆتۆمبیل بۆ گواستنەوەی هێزەکە ئامادە بکات.

کەوتە خۆئامادەکردن بۆ ئەوەی بەپێ بکەوێتە ڕێگاو چەند کەسێکی تری ناردە دیوی ئێران بۆ کڕین و ئامادەکردنی نان و خواردەمەنی و دانانی لەسەر ڕێگەی تێپەڕبوونی هێزەکە.

سەرکردایەتی بەشی دووەمی هێزەکە، بەمە هەڵەیەکی یەکجار گەورەی کرد بەوەی کە خۆی دواخست و لەکاتی دیاریکراودا نەکەوتە ڕێگا، وە لەوەش گەورەتر بەتەمای ئۆتۆمبیلی ئێران و بەئاگاداری ئێران خۆی دواخست و نەخشەکەی بەتەواوی دەرکەوت بۆ ئێران و ئەو (جەدوەلە زەمەنی)یەی کە بۆ جوولاّن و بەڕێکەوتن و یەکگرتنەوەی هێزەکان دانرابوو، تێکچوو و ئێرانیش لەباتی ئەوەی ڕێگەی تێپەڕبوونیان بدات بەئۆتۆمبیل، لەو ماوەیەدا بەناوی (مناوەرەی) هێزەکانی پەیمانی سەنتو هێزێکی یەکجار زۆری سازداو بەدرێژایی سنوورەکانی ئێران و عیراق هەموو شوێنە گرنگ و جادەو ڕێگاوبان و تەنانەت قاچاغە ڕێگاکانیشی داگیرکرد، وە هەر زوو زوو کەوتە خۆی و هەموو ئەوانەشیان گرتبوو یاخود کڕیبوو کە چووبوون بۆ ئێران بۆ ئامادەکردنی نان و خواردەمەنی بۆ هێزەکە.

جگە لەمانە هێزێکی گەورەی تری حکومەتی ئێران لەشاخەکانی دەروپشتی نۆکان، توژەڵە، گورەشێر.. دامەزراو هەڕەشەی لەهێزەکانی (ی.ن.ك) کرد کە هێشتا لەو ناوچەیەدا بوون کە ئەگەر لەماوەی چەند سەعاتێکدا ناوچەکە چۆڵ نەکەن هێزی زەوینی و ئاسمانی لێیان ئەدات.

بەشی دووەمی هێزەکە کە لەکاتی دیاریکراوی خۆی دواکەوتبوو، لەگەڵ بەشی سێیەمی هێزەکە کە ئەویش بەهۆی دواکەوتنی بەشی دووەمەوە، کاتی جولاّتی خۆی دواخستبوو، بەناچاری هەموویان پێکە وە کەوتنەڕێ بەرەو قەندیل.

لەگەڵ جوولاّنی هێزەکانی (ی.ن.ك) دا، هێزی ئاسمانی ئێران کەوتە فڕین بەسەر ئاسمانی ناوچەکەدا، وە بەسەر هێزەکانی (ی.ن.ك) دا، جگە لەمەش هێزی زەوینی هەموو ڕێگاکانی داگیرکرد بۆ ئەوەی ڕێگەی تێپەڕبوونی هێزەکانی یەکێتی بگرێت، وە کاتێك کە کاروانێك ولاّغ لەبەر گیرانی ڕێگا بەهۆی بەفرەوە، ناچار بوو بچێتە ناو سنووری ئێرانەوە، هێزەکانی ئێران دایانە بەر تۆپ و ناچاریان کرد کە بگەڕێتەوە دیوی عیراق.

هەرچەندە مام جەلال لەدوای تەقاندنی تۆپ و زیادبوونی فڕینی فڕۆکەکانی ئێران، لەکۆبوونەوەیەکدا، داوای لەسەرکردایەتیی هێزەکە کرد کە بکشێنەوە (دولەکورگی)ەوە بەپێی ئەو فاکتەرە نوێیانە

لەمەسەلەکەدا، سەرلەنوێ بیر لەهەموو نەخشەکە بکرێتەوەو حساب و نەخشەو ڕێگەو شوێنی نوێ دابنرێ*.

بەڵام سەرکردایەتی هێزەکە، ئەم پێشنیارەی پەسەند نەکردو سووربوو لەسەر درێژەدان بەڕۆیشتنەکەو لەپاش ماندووبوونێکی زۆر بەشی دووەم و سێیەمی هێزەکە گەیشتنە دولەنی قەندیل، وەلەوێ سەر لەنوێ هێزەکە کرایەوە دوو بەش، بەشی هەرە زۆری پێشمەرگە چەکدارو چالاک و لاوەکان لەگەڵ بەشی دووەمی هێزەکە نێردراو شەهید عەلی عەسکەری (ئەندانی م.س-(ی.ن.ك) و فەرماندەی هێزەکە)، تایەری عەلی والی (ئەندامی م.س و م.ع-(ی.ن.ك))، عومەر عبدالله (ئەندامی م.ع-(ی.ن.ك)) سەید کاکە (ئەندامی ك.س و ف.ه٨ی هەولێر)، تالیب ڕۆستەم (ف.ه٦ی قەلادزە)، ئازاد هەورامی (ئەندامی م.س-(ی.ن.ك)) قادر مامەند (فەرماندەی هێزی پشدەرییەکان)، ملازم فوئاد (نوێنەری لجنە تحچیری) لەگەڵ ئەم هێزە بەڕێکەوتن وە مام جەلال و نەوشیروان لەگەڵ نوێنەرانی لجنە تحچیری: د.مەحمود قادر جەباری، نوێنەری پاسۆك، جەلالی حاجی حسێن لەگەڵ پاشماوەی هێزەکە مانەوەو کرایە بەشی

---

* لەم کۆبوونەوەیەدا جگە لەشەهید عەلی عەسکەری، تایەری عەلی والی، عومەر عبدالله، نەوشیروان... دکتۆر مەحمود قادر جەباریش بەشدار بوون.
لەوەڵامی ئەم ڕەئیەدا، هەر لەو کۆبوونەوەیەدا شەهید عەلی عەسکەریوتی: ئەمە چۆن ئەبێ هەردوو تۆپ تەقی ئێمە نەخشەو پلانەکانی خۆمان بگۆڕین، وە گوچانەکەی لەکاتی قسەکردندا بەتووڕەییەوە کێشا بەبەدێکاو شکا.

سێیەم[**] وە هەموو نەخۆش و پەککەوتەو بەشی هەرە زۆری بێ چەك و گومان لێکراوەکان، بەرەو رووی بەشی سێیەم کرایەوە کە لەو ماوەیەدا بەشێنەیی بیان نێرێتەوە دواوەو بەژمارەیەکی کەم و پوخت خۆی بشارێتەوەو چاوەڕێی هەواڵی یەکگرتنەوەی بەشی یەکەم و دووەم بکات و ئینجا ئەمیش بکەوێتەڕێ بۆ لای ئەوان.

بەم جۆرە بەشی دووەمی هێزەکە بەلای خانەدا بەرەو پشتی شنۆ کەوتە رێ و بەشی سێیەم لەقەندیل مایەوەو کەوتە چاککردنەوەو پوختەکردنی ریزەکانی خۆی، بەنیازی خۆحەشاردانێکی نهێنی و ئەمین و لەدۆڵی بالەییان تا گەیشتنی هەواڵی بەشی دووەمی هێزەکەو یەکگرتنەوەی لەگەڵ بەشی یەکەم و ئەوسا بەڕێکەوتنی ئەمنیش لەباڵەکایەتییەوە بەرەو هەڵگوردو لەوێوە بەرەو برادۆست و یەکگرتنەوەی لەگەڵ ئەوان.

بەشی یەکەمی هێزەکە، هەروەکو پێشتر وترا بەشێکی رێگاکەی خۆی تا لەرێگای خانە-حاجی ئومەران تێپەڕی بوو لەدیوی ئێران و بەشەکەی تری تا برادۆست لەدیوی عیراقەوە تێپەڕاند، هێزەکە تووشی ناخۆشییەکی ئەوتۆ نەبوو، بەتایبەتی چونکە هێزەکانی دوژمن هێشتا

---

[**] لەکاتی بەرێکردنی هێزەکەدا، لەدوولەنی سەرلەنوێ مام جەلال و د.مەحمود و عەلی عەسکەری بەدوورو درێژی قسەیان بۆ لێپرسراوو فەرماندەی هەرێم و کەرت و مەفرەزەکانی ناو هێزەکە کرد دەربارەی ئەرك و فرمانەکانی ئەو هێزە.

بەخۆنەکەوتبوون، وە تا گەیشتنە شوێنی دیاریکراو تەنیا یەك شەهیدی دابوو لەگوندی بیرکمە لەناوچەی سیدەکان.

بەشی دووەمی هێزەکە کە زۆربەی رێگاکەیان تا نزیك ٣ سنوور لەدیوی ئێرانەوە رۆیشتبوو، جگە لەوەی تووشی ماندووبوونێکی زۆر، برسێتی، سەرماو بەفرو سەهۆڵبەندان بوون، هێزەکانی حکومەتی ئێران لەچەند جێگا بۆردوومانی کردن و چەند پێشمەرگەی شەهیدو بریندار کرد، وە بەجۆرێکی وا رێگەوبانەکانی لیٚ تەنیبوون بۆ ئەوەی بەسەرماو برسێتی تەفرو تونایان بکات، کە ئەگەر نەختێك خواردنی چەند شوانێك نەبووایە لەپشتی شنۆ کە لەخێوەتێکا زەخیریان کردبوو وە پێشمەرگەکان بەرێکەوت تووشی بوون بەشێکی زۆری هێزەکەیان لەبرسان لەناو بەفرا رەقئەبوونەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تا هێزەکە هەمووی گەیشتەوە دیوی عیراق چەندین کەسی لەپێناوی هێنانی نان و خۆراکدا لەدەوروپشتی گوندەکانی ئێران کەوتنە بۆسەی ئێرانییەکانەوەو گیران، چەندین کەس خۆیاندا بەدەستەوە، وە چەندین کەس رەق بوونەوەو ئەوی تر بەهەزار قەلاکەت و ناخۆشی بەنیوە گیان گەیشتنەوە دیوی عیراق، بەڵام هەر گەیشتنە دیوی عیراق و پێشمەرگەیەکی بەزیوی بەدزییەوە رای کردو تەسلیم بووەوە، هێزەکانی حکومەتی عیراق کە پێشتر خۆیان ئامادەکردبوو دەستبەجێ لەخرینە پەلاماری بەشی دووەمی هێزەکەیان

دا کە هێشتا پشوویان نەدابوو، بەتایبەتی بەهەلیکۆپتەر هێرشیان هێنایە سەر هێزی پێشمەرگەو چەندین کەسیان شەهیدو بریندار کرد.

هەرچەندە ئەم هێزە هەندێ نان و خواردەمەنیان پەیدا کردبوو، بەڵام هێشتا نەماندویەتی ڕێگایان دەرچوو بوو، وە نە گەرم بووبوونەوە، وە نەحەوابوونەوە.. بەو وەزعەوە سەرلەنوێ ناچار بوون بکشێنەوە دۆڵی خواکورك و لەوێش دیسانەوە هێزەکانی عیراق بەهەلیکۆپتەر دابەزی و پەلاماری دان و نەیهێشت وچان بدەن و خۆیان ڕێکبخەنەوە، چەند پێشمەرگە شەهید بوون و چەند پێشمەرگەیەك گیران، لێرەشەوە دیسان بەناچاری گەڕانەوە ناوچەی شەمزینان لەبەری تورکیا.

بەشی یەکەمی هێزەکە کە پێشتر گەیشتبووە هەمان ناوچەو مشووری هەندێ ئازووقەو خواردەمەنی خواردبوو لەگەڵ بەشی دووەمی هێزەکە یەکیان گرتەوەو لەسەر سنووری تورکیا-عیراق- ئێران کەوتنەوە ڕێکخستنی هێزەکانیان و پشوودان و خۆکۆکردنەوە*.

ئەو مەینەتی و ناخۆشی و زەرەرو زیانە زۆرەی تووشی هێزەکە بوو، هەمووی نرخی ئەو هەڵە کوشندانەیە کە وەکو پێویست حسابیان بۆ نەکرابوو، بەرێکەوتنی هێزەکانی عیراق بەرەو ناوچەی ٣ سنوور بەو شێوەیەی کە باس کرا، گەلێك هەڵەی سیاسی، پێشمەرگەیی، جوگرافی، تیا کرا کە ئەمانە هەندێکیانە:

---

* بڕوانە بەڵگەی ژمارە (١).

## ١-گوێ نەدانە پیلانی هاوبەشی دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە دژی (ی.ن.ك).

حکومەتەکانی ئێران، عیراق، تورکیا، گەلی کوردو مەسەلە ڕەواکەی بەدوژمنی دێرینەو هاوبەشی خۆیان ئەزانن، بۆیە سەرەڕای هەموو ناکۆکییە قووڵەکانی ناو خۆیان هەمیشە لەکاتی پێویستدا هاوکاریی یەکیان کردووەو یەکیان گرتووە بۆ شکاندنی جووڵانەوە شۆڕشگێڕییەکانی گەلی کوردستان.

شای ئێران و سەدام حسێن لە١٩٧٥دا لەجەزائیر ڕێککەوتنێکیان ئیمزاکرد بۆ هاوکاریکردن دەربارەی پاراستنی ئاسایش و ئارامی هەردوو دیوی سنووری عیراق و ئێران.

حکومەتەکانی عیراق و تورکیاش لەساڵی ١٩٧٧دا ڕێککەوتنێکی تری لەو بابەتەیان مۆرکردبوو بۆ پاراستنی ئاسایش و ئارامی هەردوو دیوی سنووری عیراق و تورکیا.

حکومەتی ئێران زیاد لە ٤٥٠٠٠٠ هێزی چەکدار هەبوو.

حکومەتی تورکیا زیاد لە٥٠٠٠٠٠ هێزی چەکداری هەبوو.

حکومەتی عیراقیش زیاد لە٢٠٠٠٠٠ هێزی چەکداری هەبوو.

شۆڕش لەکوردستانی عیراقدا، بەو ڕێبازە سیاسی و پێشمەرگەییە، پێشکەوتنخوازانەیەوە لەقۆناغی ئەوسای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە سەرانسەری ناوچەکە لەژێر زەبرو زەنگی حکومەتە کۆنەپەرست و

فاشستییەکانی ناوچەکە هێمنییەکی رووکەشیان تیا بڵاوکردبووەوە، شۆڕشی کوردستانی عیراق بووبووە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر ئەم دەوڵەتانە، بۆیە شتێکی ئاسایی بوو کە لەکاتی پێویستدا قۆڵ بکەن بەقۆڵی یەکتریداو پیلانی هاوبەش دابنێن بۆ لەناوبردنی.

لەکاتی بەرێکەوتنی هێزەکانی (ی.ن.ك) دا هاوکاری ئەم ٣ دەوڵەتە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دیاربوو:

حکومەتی عیراق چەندین ئەفسەری سوپایی و پسپۆڕی جاسوسی ناردبووە ئێران و تورکیا بۆ یەکخستنی زانیارییەکان و دانانی پلانی هاوبەش، هەروەکو حکومەتی عیراق زۆربەی ناوچەکانی سنووری راگوێزرا بوو، رەوەندەکانیشی قەدەغەکردبوو لەوەی کە بەمەڕو ماڵاتەوە بێنە کوێستانەکان بۆ ئەوەی پێشمەرگە سوودیان لێ وەرنەگرێت، هەروەها حکومەتی ئێرانیش رەوەندەکانی قەدەغە کرد لەهاتنە کوردستان، تەنانەت ئەوانەشیان کە هاتبوون، بەزۆر گێڕانییەوە دواوە.

(ئەرتەشی ئێران) بەناوی مناوەرەی پەیمانی سەنتو هەموو رێگاوبانەکانی گرتبوو، تووشی هەر کەس ببوایە ئەیگرت، هەروەها هەموو ئەوانەی کە پێشتر نێردرابوونە شارەکانی سەردەشت، خانە بۆ ئامادەکردنی خواردن یا گرتبوونی وە یاخود کڕیبوونی و دەستی بەسەر کەلوپەلەکاندا گرتبوو، جگە لەمانەش فڕۆکە بەردەوام چاودێری

هێزەکانی (ی.ن.ك) ی ئەکردو هەندێکجار بەهەیکۆپتەر ئاگربارانی ئەکردن.

هێزەکانی ئێران لەدیوی ئێران کەوتنە لێدانی هێزەکانی ی ن ك وە هەر کە چوونە دیوی عیراق لەوێش هێزە چەکدارەکانی عیراق کەوتنە پەلاماردانی و کە چووە دیوی تورکیا لەوێش عەشیرەتە کۆنەپەرستەکان کەوتنە خۆئامادەکردن و میت و داو دەزگا جاسوسییەکانی تر کەوتنە پەیجوریان.

سەرکردایەتی (ی.ن.ك) هێزی دوژمنەکانی بەکەم گرت یاخود ئەم مەترسییەی باچاکی هەست پێ نەکرد، چاوپۆشینی حکومەتی ئێران لەهاتووچۆی پێشمەرگە بەناوچەکانی سنوورا، کە لەڕاستیدا بۆ شاردنەوەی دالدەدان و یارمەتیدانی هێزە چەکدارەکانی (ق.م) بوو، وە چاوپۆشینی حکومەتی تورك لەدانیشتنی هێزەکانی (ق.م) لەناوچەکانی سنووردا، دەسخەڕۆی کردو بەگورگانخواردوی دا، وای زانی ئەم چاوپۆشینەهێزەکانی (ی.ن.ك) یش ئەگرێتەوە، کەچی لەئەنجامدا بوو بەهۆیەکی کاریگەری ئەو شکستە گەورەیە.

٢-پاش ڕێکخستنەوەی هێزەکەو باش نەناردنی بۆ شوێنی دیاریکراو.

هەرچەندە هێزەکە کرابووە ٣ بەش و دوایی بووە دوو بەش بەڵام هەر بەشێکی لەچاوەڕێی ڕۆیشتنی وەهاو بەڕێگایەکی واها دووری پڕ

مەترسیدا بو جەنگی پارتیزانی، لەھەلومەرجێکی وەکو ئەو کات و شوێنەی کوردستاندا، ھەڵەیەکی گەورەیە.

ھێزەکە لەبەر گەورەیی خۆی و درێژی رێگاو ناڕێکی و سەختی بووبووە رێچکەیەکی زۆر دوورو درێژ کە بەھۆی لەپڕێزی دەرچوونی یەکێکەوە بۆ پشودان و وچان گرتن، بۆ ئاو خواردنەوە یاخو توندکردنەوە، ھەموو ریزەکە تێکئەچوو وە زنجیرەکە لەپچڕار لەبووە ھۆی دواکەوتن و لەیەك دابڕان و لەیەك ونبوون.

لەبەر گەورەیی و درێژی رێچکەکەو نەبوونی ھۆی پەیوەندی (وەکو ھۆکی تۆکی) نە ئەتوانرا بەچاکی سەرپەرشتی بکرێت، ھەرچەندە ھێزەکە کرابووە چەند (رەتل)و ھەر رەتلە لێپرسراوی خۆی ھەبوو، بەلام دیسانەوە چونکە ھەموو پێکەوە بەیەك رێگای باریکدا ئەرۆیشتن و بەیەك خێرایی نەئەڕۆیشتن، بەچاکی سەیتەرەیان بەسەرا نەئەکرا.

تەئمینکردنی ئازووقەو خواردەمەنی و پێویستییەکانی تری ھێزێکی وا گەورە بەتایبەتی لەو شوێننە چۆلانەدا کە ئەوان پیا تێئەپەڕین کارێکی یەکجار دژوارو زەحمەت بوو.

ھێزەکە لەبەر زۆری ژمارەی خۆی، نەیئەتوانی خۆی لەدوژمن بزر بکا و خۆش بشارێتەوە، شوێنە ولی بکار شوێنەوارەکانی پاش خۆی بسڕێتەوە.

جوولانی هێزەکە بەو گەورەییە، بەپێ، بەو ڕێگا دوورو درێژە باریك و شاخاوییە، کە ئاوەدانی تیا نییەو هێشتا بەفر گرتبووی کارێکی زۆر خراپ بوو، جوولاندنی هێزی (جەیشی نیزامی)یە لەکاتێکدا کە جەیشی نیزامی ماشێن و فڕۆکەی هەیە بۆ گواستنەوەو تەئمینکردنی پێویستییەکانی خواردن و خۆگەرمکردنەوەو ماندوونەبوون و پەیوەندییکردن و توانای زوو دەربازبوون و زۆر پەلاماردان و زوو کشانەوەی هەیە، بۆ لەشکرێکی پارتیزانی کە بێبەشە لەو ئیمکانیاتە هەڵەیەکی ئەوەندە گەورەیە، لەحوکمی خۆکوشتن دایە.

هێزەکانی (ی.ن.ك) ئەبووایە بەتاقمی کەم کەمی ١٠٠-١٥٠ کەسی بڕۆشتایە نەك هەمووی بە کۆمەڵ پێکەوە.

ئەبوایە ئەو تاقمانەش ڕێگای جیاجیایان بگرتایە نەك هەموویان یەك ڕێگایان بگرتایە بەر.

ئەبوایە لەکات و شوێنی جیاوازەوە بەڕێ بکەوتایەو لەکات و شوێنی دیاریکراوا یەکیان بگرتایەوە.

ئەبوایە هەر تاقمە چەندین سەرچاوەی تەئمینکردنی ئازووقەو پێویستییەکانی تری لەپشتەوە لەچەند شوێنی جیاجیاوە تەئمین بکردایە.

ئەبوایە هەر تاقمە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەو شوێنی حەوانەوەی جیاوازو رابەرو چاوساغی بدایە.

**٣-گوێ نەدانە مەناخ و تۆپۆگرافی ناوچەکە:**

ئەو کاتەی هێزەکە بەرێکەوت هێشتا سەرەتای بەهار بو، وە ئەو ناوچانەی کە ئەبوو بیبڕێت هەموو کوێستانی سەخت و چۆڵ بوون، شاخی هەزار بەهەزاری رووت و دۆڵی قووڵ، دوور لەئاوەدانی، زۆر جار تاسەرەتای هاوین بەفر ئەیگرێ و ماوەی هاتوچۆکردن نادات.

زۆر جار سوپا نیزامییە گەورەکان هەر بەهۆی حسابنەکردنی وردو تەواوی عامیلی مەناخ یاخود عامیلی تۆپۆگرافی شکستی زۆر گەورەیان بەسەر هاتووە، تەنانەت سوپای عیراقی لەچەندین پەلاماری پایزو زستاندا هەر لەبەر بەفرو سەرماو گێژەڵۆکە شکاوە، یاخود لەبەر سەختی و نالەباری ناوچەکەو تێکەڵبوونی لەگەڵ نالەباری هەوا شکستی گەورەو زیانی زلی گیانی لێ کەوتووە.

کاتێ بەرێکەوتنی هێزەکانی (ی.ن.ك) لەچاو مەناخی ناوچە شاخاوییە سەختەکانی کوێستانەکانی کوردستانداو زۆر زووبوو، بۆیە جگە لەوەی بەفری شاخەکان هێشتا نەتوابووەوەو رێگاکانی بەرنەدابوو، پێشمەرگە رەشایی نەئەدۆزیەوە تا بحەوێتەوە یا تیا دابنیشێ چ جای شوێنی نوستن، جگە لەوەش هەندێ جار ئەبووەوە بەفرو زریان، رێگایەکی وەها ئەگەر چەند سەعاتێك بێ، یاخود ماوەی چەند رۆژێك بێت رەنگە کاریکی ئەوتۆ نەکاتە سەر پێشمەرگە بەڵام ماوەی چەند هەفتەیەك کە درێژەی کێشا بێ کەلوپەلی خۆگەرمکردنەوەو بێ سووتەمەنی و خواردەمەنی و شوێنی حەوانەوە، وا سەرەڕای ئەوەی توانای جەنگاوەرانەی پێشمەرگە

**ناهێڵێ، بەڵکو پرزەی لێ ئەبڕێ و قڕی تێئەخات، هەروەکو بەسەر ئەم هێزە هات.**

بەشی یەکەم و دوورەمی هێزەکەی (ی.ن.ك) کەوا لەناوچەی برادۆست یەکیان گرتبوورەوە بۆ پشوودان و خۆرێکخستنەوە پەڕیبوونە دیوی تورکیاو ٧ رۆژ لەوێ بەناسوودەیی مابوونەوە، لەباتی ئەوەی خەریکی خۆسازدان بن بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ل.س-(ی.ن.ك) لەسەرو هەموویانەوە دامەزراندنی بنکەو بارەگای سەرکردایەتی (ی.ن.ك) لەشوێنەکانی پارو هەواڵناردن بۆ هاتنی بەشی سێیەمی هێزەکەو ئەندامانی ل.س سەرکردایەتی هێزەکە بەبیانووی ئەوەی کە ئەوان زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتیان لەگەڵەو بەپێی هەلومەرجی نوێ ئەتوانن بڕیاری نوێ بدەن، بەتایبەتی دوای ئەوەی راسپێردراوێکی ئیدریش ئەگاتە لایان و پێیان رائەگەیەنێ کە پیاوەکانی ئیدریس لەناو چەکدارەکانی (ق.م) دا نایەنە سەر رێگای هێزەکانی ی ن ك ئەگەر ئەوان نەچنە سەریان، سەرکردایەتی هێزەکە بڕیار ئەدا لەباتی مانەوە لەناوچەی برادۆست و دانانەوەی بارەگا لەدۆڵی گۆستە بۆ ئەوەی تووشی شەڕ نەبێ لەگەڵ (ق.م)، بڕیار ئەدا کە بچێتە ناو قووڵایی تورکیاوە بەبیانووی ئەوەی کە گوایە نزیکبکەونەوە لەشوێنی وەرگرتنی چەك و چەکدارکردنی بێ چەکەکانی هێزەکەیان.

بەم جۆرە سەرکردایەتی هێزەکە پشت ئەستوور بەبەڵێنە درۆو ناڕاستەکانی دەدەکادەو پشت ئەستوور بەبەڵێنەکانی ئیدریس خۆی لەشەڕی (ق.م) لائەدا لەو ناوچەیەدا، کە زەعیف ترین نوقتەیان بوو، یا راست تر خۆی لەشەڕی (ق.م) ئەدزێتەوەو لەناوچەکە دوور ئەکەوێتەوە بەرەو قوڵایی تورکیا بەبێ ئەوەی شارەزاییان هەبێ لەناوچەکەدا، ناساویان هەبێ لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا، لەپێش خۆیانەوە بنکەیەکیان هەبێ پێشڕەوی بۆ بکەن، یا لەپشتی خۆیانەوە بنکەیەکیان هەبێ بۆی بکشێنەوە، بێ ئەوەی بنکەیەکی جەماوەری سیاسییان لەناو کوردەکانی تورکیادا هەبێت، بێ ئەوەی حساب بۆ خۆکۆکردنەوەو پەلامارجانی (ق.م) یاخود بۆ (تدخل)ی هێزە چەکدارەکانی تورکی و پیلانی میت یا خۆسازدانی عەشیرەتە کۆنەپەرستەکانی تورکیا بکەن.

(ق.م) هێڵێکی ئاشکراو دیاری لەنێوان خۆی و (ی.ن.ك) دا کێشابوو، وە هێزەکانی (ی.ن.ك) وەکو دوژمنێکی سەرسەخت دانابوو وە لەناو بردنیانی کردبووە ئەرکی یەکەمی سەرشانی خۆی.

(ق.م) لەماوەی دوو ساڵی پێشوودا لەهەر شوێنێ بێت و توانای هەبو دەست لە (ی.ن.ك) بوەشێنێت .

رێگەی لەهێنانی چەك گرتبوو وە هەر لەیەك کەمیندا ١٠دۆشکای گرت و ٩ کەسی کوشت و ئەوانی تری گرتن.

سارد نەبووەوە، وزەی جەنگاوەرانەی پێشمەرگەکانی لەبەگژداچوونی (ق.م) و قین و تووڕەییان کەم نەبووەوە بەرامبەریان.

سەرلێشێوان و دوودڵی لەکێشانی خەتی جیاکەرەوەی دۆست لەدوژمن و سستی کردن لەسازدانی سیاسەتی کۆمەڵانی خەڵك بۆ ناسینی دۆستی راستەقینەی و دوژمنی راستەقینەی، وە کەمتەرخەمی لەدیاریکردنی رێبازی سیاسی و شێوەی بەگژداچوونی دوژمن و چۆنیەتی تەختکردنی سەخت و دژوارییەکانی رێگاکەی، گوێ نەدانە پەروەردەکردنی خەڵك، بەتایبەتی تێکۆشەرە شۆڕشگێڕو جەنگاوەرەکانی، بەگیانی بەزەیی نەهاتنەوە بەدوژمن داو بەگیانی لێدانی سەخت و کوشندەی دوژمن، سەر لێ شێوان و دوو دڵی لەدیاریکردنی دوژمن و رارایی لەلێدان و پاککردنەوەیدا، هەڵخەڵەتانو فریوخواردن بەفێڵ و فەرەجی دوژمن و دەستپاراستن و خۆلادان لەلێدانی لەهەلی لەبارو کات و شوێنی لەباردا، هەڵەیەکی کوشندەیە، باری بەکارهێنانی هەڵەکە هەڵئەگرێتەوە بەقازانجی دوژمن.

(ق.م) ئەوەندەی بۆی کرابوو لەناو هێزەکانی خۆی و لەناو خەڵ
پڕوپاگەندەی دژی (ی.ن.ك) و سەرکردایەتی کردبوو.
(ق.م) لەو شوێنانەدا کە بەناوی پێشمەرگایەتییەوە ئیتر نەیئەتوا
ناوو ناوبانگی شۆڕش و پێشمەرگە خراپ بکات و دەست لە (ی.ن.ك
بوەشێنێ ئەبووە جاش و لەپەنای حکومەتدا دەستە جاشی پێکوە ئەنا
بەگژاچوونی (ی.ن.ك) و راوی پێشمەرگەکانی.
کەچی لەگەڵ هەموو ئەم رەفتارە دوژمنانەیەی ق م و لەگەڵ هەموو
ئەو تەجروبە تاڵ و ناخۆشەدا کە لەماوەی دوو ساڵدا (ی.ن.ك) لەگە
(ق.م) و کوڕەکانی بەرزانی کردبووی هێشتا مەسەلەی (ق.م) لەلای
هەندێ لەسەرکردەکانی (ی.ن.ك) ساغ نەبووبووەوە هێشتا هیوای
(پێکەوە ژیان)یان هەبوو وە ئەوانیان بەبرا لەقەڵەم ئەداو شەڕکردنیان
لەگەڵ ئەوان بەشەڕی براکوژی دائەنا، لەکاتێکدا (ق.م) چەکدارەکانی
خۆی فێر ئەکرد بەوپەڕی توندوتیژییەوە لە (ی.ن.ك) بدەن کەچی
سەرکردەکانی (ی.ن.ك) بەپێچەوانەوە پێشمەرگەکانیان خاو ئەکردەوەو
بەبەڵێن و قسەکانی ئەوان، کە بەهۆی لاوازی و کەم دەسەڵاتییەوە
ئەیانکرد، دڵی خۆیان خۆش ئەکردوخاو ئەبوونەوە ئەمە وای کرد کە
(ق.م) هەلی دەستکەوێ بۆ خۆکۆکردنەوەو خۆ ئامادەکردن و
پەلاماردان، کەچی (ی.ن.ك) هەلی لەکیس ئەچوو، خۆی لەشەڕ لائەدا،

بەرێکەوتنی هێزەکانی (ی.ن.ك) بەرەو قوڵایی تورکیا پشت ئەستو
بەقسەکانی دە.دە.کا.دە بەناوی هێنانی چەکەوە، بێ ئەوەی بنکەیەک
پشتەکی یان بنکەیەکی پێشەوەیان هەبێ، بێئەوەی بزانن بۆ کوێ و بەر
کوێ بۆ لای کێ ئەچن، بێ ئەوەی لەوێ بنکەی سیاسی و جەماوەرییا
هەبێت... لەکاتێکدا کە (ق.م) بەشی هەرە زۆری عەشیرەتەکانی خەڵک
دێهاتەکانی تورکیایان لەیەکیتی پڕکردبوو، کە گوایە هێزەکانی
(ی.ن.ك) ئەچنە دیوی تورکیا بۆ تۆڵەکردنەوەی ئەوانەی ساڵانی پێشو
لێیان کوژراوە، گوایە هێزەکانی (ی.ن.ك) دێهاتەکانی تورکیا تاڵا
ئەکەن و ئەسوتێنن و پیاوەکانیان ئەکوژن و ئافرەتەکانیان بەدیل ئەگر
و هاتوو بۆ بڵاوکردنەوەی بێدینی و کافری و یەزیدیەتی و کۆمۆنیزم و
بەفیتی سەدام و بەعس ئەیانەوێ شۆڕشەکەی بەرزانی تێك بدەن!.

بەم درۆو دەلەسانە (ق.م) خەڵکی ناهۆشیارو دواکەوتووی ناوچەکانی
شەمزینان، گەورە، چەلی، ئولودەرە..یان هاندابوو لە (ی.ن.ك) و سەرۆك
عەشیرەتەکانی ناوچەکەش کە ژمارەیەکی زۆریان لەحزبی کۆنەپەرستی
(عەدالەت) و (سەلامەتی میلی) دان و بەپێی ئامۆژگاری و فەرمانی
میت ئەجوڵێننەوە، کەوتنە خۆو هێزەکانی خۆیان کۆکردەوەو سازداو

پرچەك كردو هەموو شوێنە گرنگ و ستراتیجییەكانیان گرت و لەسەر ڕێگاو پردو گەلی و دەربەندو بواری چەم و رووبارەكان لەناوچەیەكی یەكجار فراوان و بەریندا دامەزران بۆ ڕێگەگرتن و لەناوبردنی هێزەكانی (ی.ن.ك).

دەنگی پارتیزانی تەنیا پشت ئەستوور نییە بەبیرو باوەڕی زاتی شۆڕشگێڕانەی پێشمەرگەكان، وە بەگیانی خۆبەخت كردن و لەخۆبران، یاخود بەلێوەشاوەیی و ئازایەتییان، بەڵكو بەشارەزایی پێشمەرگەكانیش لەهەوزاو نشنێو و كون و قوژبنی ناوچەكەدا وە بەپەیوەندی باش و دۆستانەی پێشمەرگەكان لەگەڵ خەڵكی ناوچەكە ، كۆمەڵانی خەڵك قەڵای لەشكان نەهاتووی پێشمەرگەن، زانیاری و دەنگوباسی بۆ كۆئەكەنەوە، ڕێگەی پیشان ئەدەن، خواردن و پێویستییەكانی تەئمین ئەكەن، ئەیشارنەوە بریندارو نەخۆشەكانی تیمار ئەكەن و ئەی حەوێننەوە، پەیوەندیی بۆ دروست ئەكەن لەگەڵ هێزەكانی تریا، لەكاتی پێویستدا چەكی بۆ هەڵئەگرن و بەرگری چەكداراتەی لێ ئەكەن، كاتێ كە خەڵكی ناوچەكە كەوتنە دوژمنایەتی پێشمەرگەكان و پێشمەرگەكان بێبەش بوون لەپشتیوانی و یارمەتی ئەوان، بەتایبەتی كە نەشارەزا بوون، وەكو ئەو ماسییەیان لێدێ كە لەئاو دەرئەهێنرێ و ئەكەوێتە وشكاییەوەو ئەخنكێ.

هێزەکەی (ی.ن.ك) بێبەش بوو لەیارمەتی و پشتیوانی خەڵکی ناوچەکە ئەو زانیارییانە کە دەءدەءکاءدە دابوی بەسەرکردایەتی هێزەکە ناڕاست بوون و دەءدەءکاءدەش خۆی هیچ هێزو نفوزێکی لەناو عەشیرەتەکاندا نەبوو، و نەیتوانی، یاخود نەیویست هیچ جۆرە هاوکارییەکی کەم یا زۆر لەگەڵ هێزەکەدا بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەندێ جار بەپێشکەشکردنی زانیاری و حسابی ناڕاست سەری لەهێزەکە ئەشێواندو چەواشەی ئەکرد.

سەرەڕای ئەمانە هەمووی، سەرکردایەتی هێزەکە خۆیشی چەندین هەڵەی جەنگی گەورەی کرد، لەپێش هەموویانەوە، بەجێهێشتنی ناوچەی برادۆست و دوورکەوتنەوەی لەخاکی کوردستانی عیراق و ملنانی بەرەو ناو قوڵایی تورکیا واتە بەرەو ناو ئەو تەپکە گەورەیە بۆی نرا بووەوە.

سەرکردایەتی هێزەکە، هەروەکو لەباری ستراتیجییەوە تووشی هەڵەیەکی کوشندە بووبوو، هەروەها لەباری تاکتیکیشەوە وەکو پێویست هێزەکەی خۆی رێکنەخست و دانەمەزراند.

سەرکردایەتی هێزەکە لەباتی ئەوەی هێزەکانی بەش بکات بەسەر چەند ناوچەی فراوانداو لەمەیدانێکی بلاودا دایان بمەزرێنێ و بیان جوولێنێ، هێزەکانی خۆی هەموو بەکۆمەڵ و پێکەوە بەیەك رێگاداو لەیەك کاتداو بۆ یەك شوێن خستەڕێ، وە هەر لەیەك ناوچەدا، یاخود راستتر لەیەك دۆڵدا مۆڵی دان، ئەمە هەلی دەست دوژمن خست کە بەچاکی

(تەرکیز)ی بکاتە سەر، دەنگوباسەکانی بەوردی کۆبکاتەوەو بزانێ، هەموو هێزەکانی خۆی لەسەر کۆبکاتەوە (بالادەستییەکی ژمارەیی) بەدی بهێنێ و دەوری هێزەکانی (ی.ن.ك) لەمەیدانێکی تەسك و سەختا بکرێ و بیخزێنێتە کوریکی تەنگەبەری شەڕو بەرگری و دەربازبوونەوە، لەکاتێکدا کە ئەگەر سەرکردایەتی هێزەکە، هێزەکانی خۆی بەش بەش بکردایەو لەچەند شوێنی دجیاوازو دوور لەیەکتریدا دای بمەزاندایە، مەیدانی شەڕ فراوان و بەرین ئەبوو، بەو پێیە دوژمنیش ئەبوایە لەچەند لایەکەوە پەلاماری بدایە هێزەکانی خۆی پەرت و بڵاوبکردایەتەوە بەناوچەیەکی فراواندا وەك لەچەند قۆڵەوە خەریك بوایە.

سەرکردایەتی هێزەکە شوێنێکی دیاری کراوی هەڵنەبژاردبوو، کە لەکاتی شەڕدا رووی تێ بکات، یا تەنانەت لەکاتی رۆیشتندا بۆی بچیت، بەڵکو هەروا لەخۆیەوە رێی کەوتبووە ئەوێ و لەناوچەی (جولەمێرگ)دا ئەخولایەوە بێ ئامانجێکی دیاریکراو ملی رێی گرتبوو، هەر لەبەرئەوە لەکاتی لێقەومان و کشانەوەو لەیەك دابڕاندا نە پێشمەرگەکان وە نەفەرماندەکانیان نەیان ئەزانی روو لەکوێ بکەن و بۆ کوێ بچن، بەڵکو بەرەو پێشەوە بڕۆن، واتە بەرەو ناو تورکیاوە، ئیتر بەیەکجاری و بەتەواوی خۆی دابڕی لەهێزەکانی (ی.ن.ك) کە کەوتبوونە ناوچەکانی هەولێرو سلێمانی و کەرکوکەوە.

ئەم هێزە بەکۆمەڵ پێکەوە بەرەو ناو قوڵایی تورکیا ڕێچکەی بەستبوو، حەفتەیەك زیاتر بەناوچەکانی سەخت و شاخاوی کوردستانی تورکیادا، بەبێ وچان گرتن و پشودان و ڕۆیشتن تاگەیشتنە ناوچەی ژیرکی یان، کە یەکێکە لەهۆزەکانی عەشیرەتی گەورەی ئەرتوشی، وە لەنزیك گوندی بچووکی (بازی) لەدولیکا بارگەو بنەی خست، سەرکردایەتی هێزەکە بەقسەو بەڵێنەکانی ئیدریس فریوی خواردبوو، کە گوایە چەکدارەکانی (ق.م) نایەنە ڕێگایان و نایانە سەریان، لەبەرئەوە پشتیان لێکردبووەوە بەبێ ئەوەی نەخشەیەکی ورد دابنێن بۆ خۆپاراستن و بەرگری، بێ خەم کەوتنە پشوودان و حەسانەوە.

دوژمنانی هێزەکە (ی.ن.ك) لەم ماوەیەدا لەلایەکەوە بەهۆی کڕین و فرۆشتنەوە چەندین کەسیان ناردە ناو هێزەکەوە بەناوی (چەرچیتی)یەوە بۆ کۆکرنەوەی زانیاری پێویست لەسەریان، هەروەها لەو ماوەیەدا یەکێك لەمەفرەزەکانی هێزەکە کە دەستەی تایبەتی پاراستنی تایەری عەلی والی بوون، بەدزییەوە ڕایان کردو چوونە ناو (ق.م) و زانیاری پێویستیان لەسەر هێزەکە، سەرکردەو لێپرسراوەکانی ژمارەی چەکدارو بێ چەکەکانی، باری گشتی هێزەکەیاندا بە(ق.م) کە ئەمە خۆی لەخۆیدا لەلایەکەوە خزمەتێکی گەورەی پێشکەش بە(ق.م) کردو زەرەرێکی زلی هەم لەباری مەعنەوی و هەم لەباری دەرچوونی نهێنییەکانی هێزەکانی یەکێتییەوە گەیاندە (ی.ن.ك).

لەم ماوەیەدا هێزەکانی (ی.ن.ك) بەهۆی خۆڕەتاندن و ڕێڕۆیشتنی دوورو درێژو نەشارەزایی و پشوونەدان و سەرماو برسێتی و نا ئەمنییەوە، بەتەواوی ماندووبوون و بێزارو وەڕەس بووبوون.. لەکاتێکدا (ق.م) سوودێکی زۆری لەو ماوەیە وەرگرتبوو بۆ کۆکردنەوەو ڕێکخستن و سازدانی هێزە چەکدارەکانی خۆی و عەشیرەتە کۆنەپەرستیەکانی ناوچەکە و دانانی پلانی پەلاماردانی هێزەکانی (ی.ن.ك).*

* ئەو عەشیرەتانەی لەشەڕی بازی دا بەشداربوون: عەشیرەتی پنیانش بەسەرۆکایەتی ماجد حاجی ئەحمەد بەگی چلی، عەشیرەتی ئورەماری بەسەرۆکایەتی فاضل شاکر ئاغا، عەشیرەتی پیروزی بەسەرۆکایەتیی کوڕانی مەلا مەحمود، عەشیرەتی دوسکی بەسەرۆکایەتیی حاجی ساڵح ئاغا.. جگە لەچەند وردە عەشیرەتێکی تر.

لەئێوارەی ڕۆژی ١٩٧٨/٦/١دا هەندێ لەپێشمەرگەکان جموجوڵ چەند چەکدارێکیان بەشاخ و لوتکەی چیاکانی دەورووپشتیانەوە بەد کردو سەرکردایەتی هێزەکەیان ئاگادارکرد، سەرکردایەتی هێزەکە دەستبەجێ کەوتە خۆی و هێزەکانی سەر خستە هەردوو بەری دۆڵەکە بەشاخەکەدا بەرەو ژوور هەڵگەڕان و دامەزران و تەقە دەستی پێکرد بەڵام دیسانەوە هێزەکانی بەجۆرێکی وادامەزراو دابەشبوو کە خۆی دابڕ لەسەرچاوەی ئاوو ڕێگای خواردنهێنان.

ئێوارەی ڕۆژی ٦/١و شەوەکەی و ڕۆژی دوایی تر شەڕ درێژەی کێشا برسێتی و تینوێتی و سەرماو درێژەکێشانی چەند ڕۆژەی شەڕ تەنگی بەهێزەکە هەڵچنی بوو تینوێتی و سەرماو درێژەکێشانی چەند ڕۆژەی شەڕ بەقازانجی هێزەکانی (ی.ن.ك) بوو، وە لەو شەڕانەدا هێزەکانی (ق.م) نەیانتوانی باڵادەستی بەدەست بهێنن و لەو شەڕانەدا لەهێزەکانی یەکێتی ڕۆژی یەکەمی شەڕ تەنیا ف.کەرت: شەعبان گیچینەیی و ڕۆژی دووەم ف: کەرت: حەمەمین خەلیفە قادرو ف.مەفرەزە: خدری کامەلای بالەیی و دوو پێشمەرگەی تر شەهید بوون و چەند کەسێك بریندgranاربوون،

لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانی (ق.م) زیاتریان لێ کوژراو بریندداربوو، وە

یەکێك لەفەرماندە ناسراوەکانی خۆیان و یەکێك لەسەنگەرە گرنگەکانی خۆیان لەدەستداو (١٢) کەسیان بەدیل گیران.

بەڵام بۆ خۆدەربازکردن لەبرسێتی و تینوێتی، وە سەبارەت بەپێویستی جێگۆڕکێی هێزەکە، بۆ ئەوەی (ق.م) نەتوانێ هێزی زۆرتر لەسەر هێزەکانی یەکێتی کۆبکاتەوەو تەوقی ئابلۆقەکە سەخت ترو تەنگ تر بکات، وە لەترسی ئەوەی نەوەکو هێزە چەکدارەکانی تورك بکەونە شەڕەکەوە، سەرکردایەتی هێزەکە بڕیاری کشانەوەی دا.

کشانەوە لەهەلومەرجێکی سەختی وەهادا بۆ هێزێکی ماندوو برسی و تینوو کەم ئومێدو کەم وورەو نەشارەزای دوور لەبنکەکانی خۆی وە بۆ شوێنێکی نەزانراوو تاقی نەکراوە، کارێکی یەکجار دژوارو زەحمەت و ئالۆزە.

کشانەوەی رێکوپێك بۆ ئەوەی جیابکرێتەوە لەهەڵاتنی نارێك و پێك پێویستی بەرێکخستنێکی وردو وورەیەکی بەرزو باوەڕێکی بەهێزو دیسپلینێکی پۆڵایین و شارەزاییەکی باش و سەرکردایەتییەکی ژیرو لێوەشاوە هەیە.

سەرکردایەتی هێزەکەی (ی.ن.ك) بڕیاری کشانەوەی داو بۆ ئەو مەبەستە کەوتە خۆئامادەکردن و خۆسازدان، هێزەکانی رێکخستنەوەو دابەیشکردن بەسەر چەند (رەتڵ)ێکدا کە هەندێکیان لەپێشەوە بڕۆن و ئەوانی تر بەدوویاندا، هەروەها هێزێکیشی تەرخانکرد بۆ پاراستنی پشتەوەی هێزەکان لەپەلاماری (ق.م) و داپۆشینی کشانەوەکە، وە (اتجاه)ی کشانەوەکەشی دیاری کرد، جا چونکە شارەزای ناوچەکە نەبوون، هەروا بەشاخەکانی دەوروپشتی خۆیاندا نیشانەیان نیشانەیان کردو ئاگاداری فەرماندەی رەتڵەکانی کرد..

لێرەدا، سەرکردایەتی هێزەکە، هەڵەیەکی تری کرد لەدیاریکردنی (اتجاه)ی کشانەوەکەدا کە چارەنووسی هەموو هێزەکەی بڕیارداو لەناوبرد، بەوەی لەباتی ئەوەی بڕیاری کشانەوە بدات بۆ دواوەو بەرەو دیوی عیراق، بەرەو ئەو ناوچانەی لێی شارەزان و ناسین و ناسیاویان هەیە، دیسان بڕیاری بەرەو پێشەوە چوون، واتە بەرەو قووڵایی زیاتری تورکیا دا، بێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکیان لەو ناوچانەدا هەبێت یاخود پێشتر تاقی کردبێتەوە.

لەتاریکایی شەوی ٢-١٩٧٨/٦/٣دا ڕەتڵەکان دەستیان کرد بەجوڵان بەنیازی کشانەوە، بەڵام هەر کە هێزەکان گەیشتنە سەر ئەو چەمەی ئەبوو لێی بپەڕنەوە، لەبەر تینوێتی بەشی هەرە زۆری پێشمەرگەکان و ڕیزی ڕەتڵەکان تێکچوو، هەندێك لەتاقمەکان پێشکەوتن و هەندێکیان لەبەر تاریکی و نەشارەزایی و پێویستی بێ دەنگ بوون لەیەکتری گوم بوون، لەکاتێکدا کە هەندێ لەڕەتڵەکانی پێشەوە تێپەڕی بوون، بۆسەیەکی بچووکی (ق.م) لەو نزیکانە بجموجوڵی هێزەکانی زانی و چەند تەقەیەکی کەمی کرد.

ئەم چەند تەقەیە بوو بەهۆی تێکچوونی تەواوەتی شیرازەی ڕێکخستنی ڕەتڵەکان، پێشمەرگەکان پەرش و بڵاوبوونەوە لەو ناوچەیەدا، تاریکایی شەوو نەشارەزایی و ماندوچونی و پەککەوتن هێزەکانی لەتوپەت کردو سەرکردایەتی هێزەکە نەیتوانی سەیتەرەی بەسەرا بکاتەوە، بەم جۆرە

هێزەکە بەدرێژایی ئەو ڕێگا دوورو درێژە هەموو پێکەوە بوو، لەیەکتری دابڕابوون، لەم کاتەدا کە پێکەوە بوون و پێکەوە ڕۆیـ لەهەموو کاتێکی کە پێویست تر بوون وە ئەبوایە لەیەکتری دانەبـ کەچی پارچە پارچە بوون، وە هەر پارچەیەکی کەوتە لایەکەوە.

ڕۆژی دوایی تر هێزەکە بووە سێ تاقم:

تاقمێکیان: ئەوانەی بە(اتجاە)ی دیاریکراوی کشانەوەکەدا ڕۆیشتبو و لەشوێنی تەقەکان دەرباز بوون.

تاقمی دووەمیان: ئەوانەی بە (اتجاە)ی پێچەوانەی (اتجاە دیاریکراوی کشانەوەکە، بەرەو ڕێی سنووری عیراق دەرباز بووبوون.

تاقمی سێیەمیان: ئەو هێزە بوو بۆ پاراستنی پێشەوەی ڕەتڵەکان داپۆشینی کشانەوەکە مابووەوە، لەگەڵ ئەو کەس و تاقماز لەدەوروبەری شەڕگەی ڕۆژانی پێشووترو سەرجەم و نزیك گوندەکە بەجـ مابوون و بەپچڕ پچڕی بێ ئەوەی هیچیان ئاگای لەوی تریان بێ پەرەوا بووبوون.

جا تاقمی یەکەم: خۆیان یەکخستەوەو دامەزران بەهیوای گەیشتنی پاشماوەی هێزەکە.

تاقمی دووەم: تومەس هەندێ لەفەرماندەی ڕەتڵەکانی هەر پێشتر تەگبیریان کردووە کە بەرەو نزیکترین نوقتەی عیراق بگەڕێنەوەو تەسلیم ببنەوە بە عیراق، بۆیە ڕێگەیان لەڕەتڵەکانیان گۆڕی بوو.

تاقمی سێیەم هەر ئەو ڕۆژە دانەدانە و بەکۆمەڵ لەلایەن چەکدارەکانی (ق.م) و عەشیرەتەکانی ناوچەکەوە گیران و چەککران.

لەناو ئەوانەدا کەلەلایەن چەکدارەکانی (ق.م)-ەوە گیرابوون، عەلی عەسکەری فەرماندەی هێزەکەو ئەندامی م.س-(ی.ن.ك) کە شەوی کشانەوە گەڕابووەوە دواوە بۆ دۆزینەوەی ڕەتڵە دابڕاوەکان*، تایەری عەلی والی ئەندامی م.س و م.ع-(ی.ن.ك)، سەید کاکە ئەندامی ك.س-(ی.ن.ك) و ف.ه٨و قادر مامەند ئاغا دەیان فەرمانەدەی کەرت و مەفرەزەو سەدان پێشمەرگە.

بەدیلگیرانی فەرمانەدەی هێزەکە، خۆی لەخۆیدا گورزێکی کوشندە بوو لەهێزەکە کەوت و یەکێك بوو لەو هۆیانەی دوژمنەکانی (ی.ن.ك) هارتر کرد بۆ پەلاماردان و ڕاونانی پاشماوەی هێزەکە.

لەناو ئەوانەدا کە بەرەو عیراق چوونەوەو تەسلیم بوونەوە تالیب ڕۆستەم ف.ه٦و شێخ جەواد بیدەری و ١٧٦ کەس کە ١١٧ چەکیان پێ بوو.

جگە لەمانە ئەوانەی کە لەتەوقی ئابلۆقەکە دەرباز بووبوون ١٧٠ کەسی چەکدارو بێ چەك بوون، لەوانە خالید سەعید، شێخ حسین بابە شێخ، عومەر عەبدوڵڵان ئازاد هەورامی، ڕەئوف مستەفا، شێخ عەلی، حامیدی حاجی غالی، عەلی ئەحمەد شیعە.

---

* ق.م لەپاش ماوەیەك عەلی عەسکەری، خالید سەعید، حسین بابەشێخیان لەگیراوەکانی تر جیاکردەوەو بە ئار.بی.جی هەرسێکیان کوشتن.

ئەم هێزە پاش ئەوەی نائومێد بوو لەگەیشتنی پاشماوەی هێزەکەمان وەکو بڕیار درابوو بەناچاری کشایەوە گوندی (کەمی) لەنزیك جولەمیرگ، وە لەوێ کەوتە خۆڕێکخستنەوەو دانانی نەخشەو پلانی نوێ، لەڕاستیدا دە.دە.کا.دە دەورێکی خراپی هەبوو لەچەواشەکردنی سەرکردایەتی ئەم هێزو سەر لێتێکدانی م.س-(ی.ن.ك)، چونکە لەباتی ئەوەی دە.دە.کا.دە زانیاری ڕاست دەربارەی لەناوچوونی پاشماوەی هێزەکە، بەدکتۆر خالیدو هاوڕێکانی بلێ، وە دەنگوباسی ڕاست بۆ م.س-(ی.ن.ك) بنێرێ، وای ئاگاداری هەردوولایان کرد کە عەلی عەسکەری و زیاترلە(٢٠٠) پێشمەرگە چوونەتەوە دیوی عیراق و لەنزیك نێروە بارەگایان دامەزراندووە.

لەپاش ئەم شکستە سەختەی بەسەر هێزەکانی (ی.ن.ك) دا هات، ئەگەر تا ئەو کاتە هەندێ لەعەشیرەتەکانی کوردستانی تورکیا دوودڵ بوون لەبەشداربوون لەو شەڕەدا کە لەبەینی (ی.ن.ك) و (ق.م) دابوو، وە خۆیان ماتکردبوو سەیری ئەنجامی شەڕەکەیان ئەکرد، لەدوای ئەو شکستە، ئیتر دەمیان چیشکە بووبوو، وە هەموویان کەوتنە خۆ بۆ ڕاونانی پاشماوەی هێزەکەی (ی.ن.ك) بەوپەڕی دڕی و دڕندایەتییەوە، هیچ

نەبێت بۆ تالآنکردن و رووتکردنەوەی پێشمەرگەکان لەچەك و پارەو سەعات، تەنانەت هەندێ جار لەپێڵاوو جل و بەرگ.

ئەو هێزەی لەشەڕی بازێ بەپچڕپچڕی دەرباز بووبوو، رۆژی دوایی تر پاش ئەوەی یەکیگرتەوە هەر لەهەمان ناوچەدا مایەوە بەهیوای گەیشتنی پاشماوەی هێزەکە، لەپاش چاوەڕوانییەکی نائومێدانە کەوتەڕێ بەرەو گوندی (کەهی) لەنزیك شاری جۆلەمێرگ (مەرکەزی ویلایەتی هەکاری).

هێزەکە چەند رۆژێك لەکەهی مایەوە بۆ ئەوەی هەم خۆی رێکبخاتەوەو هەم رێوشوێنی رۆیشتنی دابنێت و پەیوەندی لەگەڵ دۆستەکان نوێبکاتەوە*.

لەو ماوەیەدا هەروەکو هێزەکەی یەکێتی حەسایەوەو پشووی داو خۆی رێکخستەوە، لەهەمان کاتدا هەموو عەشیرەتەکانی ناوچەکە بەتێکڕایی خۆیان سازدابوو، وە سەراسەری ناوچەکەیان گرتبوو، تەنانەت هەواڵنێرەکانی تورك لەو وتارو هەواڵانەدا کە بەم بۆنەیەوە لەو رۆژانەدا ئەیاننووسی هەروەکو دانیان بەوەدا نەنا کەوا ئەم هێزە بەنەخشەیەکی زیرەکانە دەرباز بووە، بەڵام لەهەمان کاتدا بەدڵنیاییەوە پێیان لەوەش ئەنا کە ئەم هێزە هەلی رزگاربوونی نییە، چونکە ئەیان زانی میت و دوژمنەکانی تر چ تەپکەیەکیان بۆ لەناوبردنی رێکخستووە.

---

* بڕوایە بەڵگەی ژمارە (٢).

لەوماوەیەدا میت و عەشیرەتەکان و (ق.م) زۆریان هێنا بۆ خەڵکی گوندی کەهی و ناوچەکە کە ئەوانیش تیرەیەکی (ژیکی)ن کە هێزەکانی یەکێتی لەوێ دەرکەن و نەهێڵن لەوە زیاتر لەو ناوچایەدا بمێنێتەوە، ئەوانیش داوایان لەهێزەکانی یەکێتی کردبوو کە بۆ ئەوەی تووشی شەڕو پەلامار نەبن ناوچەکە بەجێ بهێڵن.

رۆژی ١٩٧٨/٦/٩ دکتۆر کەمال خۆشناو و سالار گەیشتنە شاری وان لەکوردستانی تورکیاو لەوێ لەگەڵ چەند کسێك لەئەندامانی سەرکردایەتی د.د.کا.د کۆبوونەوە بۆ باشکردنی وەزعی هێزەکەو دانانی ڕێگەو شوێنی دەربازبوونیان.

هەر ئەو کاتە گوایە لێپرسراوەکانی د.د.کا.د کەوتبوونە خۆ بۆ دەربازکردنی هێزەکە، گوایە پەیوەندییان لەگەڵ عەشیرەتەکانی ناوچەکە کردووەو بەڵێنیان لێ وەرگرتوون کە شەڕ بەهێزەکانی یەکێتی نەفرۆشن و ڕێگەیان لێ نەگرن، وە گوایە چەند ڕێبەرو ڕێ پیشاندەری گوییان ئامادەکردووە لەگەڵ هێزەکەدا بن و بچنە ناوچەی عەشیرەتی گویی لەسەر سنووری ئەلودەرە-زاخۆ.. لەوێ ئیتر ئەکەونە ناو عەشیرەتێکی دۆستەوە.

لە وان کە نوێنەرەکانی یەکێتی داوا لەلێپرسراوەکانی د.د.کا.د ئەکەن کە ڕێگەو شوێنی گەڕانەوەی هێزەکەی یەکێتی بەرەو ناوچەکانی شەمزینان-برادۆست دابنێن و لەو ڕووەوە یارمەتیان بدەن،

لێپرسراوەکانی دە،دە،کا،دە سوور ئەبن لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕێگایانە هەموو گیراوەو تەنیا ڕێگەی دەربازبوون ئەوەیە کە ئەوان بیریان لێکردۆتەوەو ئەمادەیان کردووەو تاقیان کردۆتەوە.

سالار لەگەڵ چەند کەسێکی دە،دە،کا،دە بەرەو نولودەرە ئەچێ بەو نیازەی مەفرەزەی گویی بەڵێن پێدراو ڕێك بخەن بۆ بەپیرەوە چوونی هێزەکەی یەکێتی بەرەو ناوچەی عەشیرەتی گویی، وە دکتۆر کەمالیش لەگەڵ لێپرسراوی هاکاری دە،دە،کا،دە ئەچن بۆ سەردانی هێزەکەی یەکێتی لەنزیك گوندی کەهی شەوی ١٩٧٨/٦/١٦ ئەچن بۆ لایان و هەندێ چەك و فیشەك و پارەو خواردەمەنیان بۆ ئەبەن.

لێپرسراوەکەی دە،دە،کا،دە بەدڵنیاییەوە ئاگاداری سەرکردایەتی هێزەکەی ئەکات کە تا ئەگەنە ناوچەی عەشیرەتی گویی تووشی شەڕ و نارەحەتی نابن، بەتایبەتی چونکە قسەیان لەگەڵ هەموو عەشیرەتەکانی ناوچەکەو گوندەکانی سەر ڕێگا کردووە بەڵێنیان لێ وەرگرتوون کە دەست نەهێننە ڕێگایان ئەمە جگە لەوەی چەند دەلیلێکی گویی یان لەگەڵەو هێزێکی گویی چاوەڕێیان ئەکات و عەشیرەت شەڕی عەشیرەت ناکات، هەروەکو دڵنیایان ئەکات لەوەی کە شەهید عەلی عەسکەری و هێزێکی تر بەسەلامەتی گەیشتوونەتە کوردستانی عیراق و لەسەر سنوور بارەگایان داناوە، بەو جۆرە هێزەکە بەجێ ئەهێڵن و هێزەکەش ئەکەوێتە خۆی کە ڕۆژی دوایی بەڕێ بکەوێت.

ئەم هێزە دوای ئەوەی لەکەهی خۆی ڕێکخستەوەو هەندێك چەك پارەو خواردەمەنی پێگەیشت و حەسایەوەو بۆ چەکیان چەکدار کر ئەگەر زانیارییە ناڕاستەکانی دەدەد،کادەدە چەواشەی نەکردایە، ئەیتوا لەتەوقی ئابلۆقەدانی دوژمن ڕزگاری بیێ و بگەڕێتەوە نارچەی ٣ سنور وە ئەیتوانی بۆ ئەم مەبەستە سورد لەئۆتۆمبیل و تکراکتۆر وەربگرێ ئەوەی بەزوریی لەنارچەی دوژمن دەربچێ، بەڵام لەباتی ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ دواوە، هەڵەکانی پێشوری دووبارە کردەوەو زیاتر بەر قوولایی تورکیا ملی نا.

ئەم هێزە هەر کە بەڕێکەوت، کەوتە نار چەند عەشیرەتی نەیار کۆکەوە کە چەند رۆژ بور خۆیان ئامادەکردبور بۆ لێدانی و لێر دامەزرابورن، عەشیرەتی گراڤی هارکارییان ئەکردن و عەشیرەتی زیوکیان لێ یان دامەزران و عەشیرەتی مام خوران تەقەیان لێکردن، هێزەکانی یەکێتی هەرچەند هەوڵی دا تورشی شەڕ نەبێت لەگەڵ عەشیرەتەکان، لەبەرئەوە چەند جار ڕێگەی خۆی گۆڕی و ڕێگەی زۆر سەخت و دژواری گرتەبەر، بەڵام هەر سوردی نەبور چونکە لەهەمور لایەکەوە بەخۆ کەوتبورن.

عەشیرەتی مام جوران کە تەقەیان لێ ئەکەن، ئەمانیش بەناچاری (٨) کەسیان بەبارمتە لێ ئەگرن بۆ ئەوەی ئیتر رێگەیان لێ نەگرن.

شەوەکی رۆژی ٦/١٩ لەکاتێکدا کە لەدەربەندێکەوە تێپەڕین، کەوتنە بۆسەیەکی گەورەوە کە سەدان چەکداری عەشیرەتی ژیریکی بەسەرکردایەتی شێخموس کەرەڤان دای نابوو*. لەم شەڕەدا کە چەند سەعاتێکی خایاند، دەیان پێشمەرگەی دلێرو ئازا شەهیدبوون و چەند پێشمەرگەیەکیش بەبریندارى بەجێمان و دوایی تورك گرتنی، وە دەیان فەرماندەو پێشمەرگەی ئازاو دڵسۆز لەلایەن عەشیرەتی ژیریکیەوە گیران، وەکو خالید سەعید، حسین بابە شێخ، عومەر عەبدوڵلا، ئازاد هەورامی، محمود عەبدالرحمن، عەلی شیعە، حامد حاجی غالی، ملازم فوئاد.. وە پاش چەند رۆژێك ئینجا تەسلیمی چەکدارەکانی (ق.م) یان کردن و بەم جۆرە دوا بەشی هێزەکەی (ی.ن.ك) لەناو چوو.

لێرەدا سەر وتاری (هەواڵنامەی کوردستانی عیراق) ژمارە (٢) ئابی ١٩٧٨ کە لەسەر هەمان کارەسات نووسراوە دووبارە بڵاوئەکەینەوە.

---

* ئەو عەشیرەتانەی لەم شەڕەدا بەشداربوون، ژیریکی سەرۆکایەتی شێخموس کەرەڤان، مام خوران بەسەرۆکایەتی موسی بگ، کوچەر، سپێرتی و گیتە.

*کۆنه پەرستانی ئێران، تورکیا، عیراق و (ق.م)
پیلان ئەگرن دژی شۆڕشی پیرۆزی گەلەکەمان.
*چەتە کورد کوژەکانی بەرزانی دوا پەردە لەسەر
دەوری خائینانەی خۆیان لائەدەن.
*کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان سوورن لەسەر درێژەدان
بەخەباتی شۆڕشگێڕانە.

-١-

جەنگ لەچەندین شەڕو نەبەردو پێکادانی دوڕاوو براوە، لەچەندین پەلاماروو کشانەوە، هێرش و راکردن، قازانج و زەرەر، سەرکەوتن و ژێرکەوتن.. پێك دێت.

هیچ جەنگێك، بەتایبەتی هیچ جەنگێکی درێژخایەن، هێشتا لەمێژوودا رووی نەداوە کە لەسەرەتاوە تاکۆتایی هەر سەرکەوتن و پەلاماروو هێرش و قازانج بووبێت، بێ پێچ و پەنا، بێ هەورازو نشێو، بێ شکان و گلان و نۆچدان، بێ زەرەرو زیان.. بەرەو ئامانج و سەرکەوتن رۆیشتبێت.

شۆڕش لەسەرەتاوە تاکۆتایی بەچەندین هەورازو نشێو، بەچەندین کۆسپ و کەندەلاندا رائەبوورێت، چەندینجار تووشی هەلچوون و نیشتنەوە ئەبێت، چەندین ژێرکەوتن و سەرکەوتنی گەورەو بچووکی بەسەر دێت، رەوتی گۆڕان و گەشەکردنی شۆڕش بریتییە لەزنجیرەیەك نوچدان، هەلسانەوە، هەلنەگوتن و راست بوونەوە، دۆڕاندن و بردنەوە، پێکەوە بەستراو، تادوا سەرکەوتن بەدەست ئەهێنێ، شۆڕشەکەی ئێمەش لەم یاسایە بەدەر نییە، تا ئەو کاتەی بەدوا ئامانج ئەگات، تووشی

چەندین شکست و نسکۆ، گلان و نوچدان، شکان و زەرەر، هەورازو نشێو.. دێت وەتا دوا سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت ئەبێت چەندین قۆناغ ببێوێت، کە هەر یەکەیان زنجیرەیەك ژێرکەوتنی جزئی و سەرکەوتنی جزئی تێدایە، جا ئەگەر هەندێك جار لەهەندێك شۆڕشدا یەك نەبەردی گەورەو کاریگەر چارەنووسی شۆڕشەکەی بڕیاردا بێت کە وا بێ گومان لەشۆڕشی نوێی کوردستاندا، لەقۆناغی ئێستادا، یەك شەڕی گەورە چەندین کاریگەرو بەئازاریش بێت ناتوانێت چارەنووسی شۆڕشەکە بڕیار بدات.

سەرکەوتن یا ژێرکەوتنی شۆڕشی ئەم جارەیان لەماوەیەکی درێژدا، لەچەندین شەڕو نەبەرددا، لەچەندین ناوچەدا، لەچەندین مەیدانی جەنگی، سیاسی، ئابووری.. دا بڕیاری لەسەر ئەدرێت.

دوژمن چەند بەهێزو توانا بێت، ئەتوانێت یەك نەبەرد یاخود چەند نەبەردییەك بباتەوە، بەڵام ناتوانێت، جەنگەکە بەیەکجاری بباتەوەو چارەنووسی شۆڕش بڕیار بدات و هێزی شۆڕش کە هێزی جەماوەری گەلە، سەرچاوەیەکی لەبن و لەبڕانەوە نەهاتووی هەیەو هێزی شۆڕش لەسەرانسەری وڵاتدا، وەکو تۆو چێنراوەو لەمەیدانی نەبەردێکا کۆنەبۆتەوەو لەناو ناچێت.

لەمانگی نیسانی ١٩٧٨ەوە هێزێکی تێکەڵاو لەپێشمەرگەی هەموو هەرێمەکانی کوردستانی عیراق خۆی سازدا بۆ بەرێکەوتن بەرەو بادینان

بەنیازی هێنانی چەك و تفاق جەنگی شۆڕش و هەڵگیرساندنی بڵێسەی پیرۆزی شۆڕش لەناوچەکانی بادینان.

هێزەکە بۆیە وا زو کەوتەڕێ تاکو پیش دەسکردنی رژێمی رەگەزپەرستی عیراق بەڕاگوێزانی دانیشتووانی ناوچەکانی سنوور، بتوانێت هەندێ چەك و تفاق بەدەست بهێنیچت و فریای چەکدارکردنی دانیشتووانی ناوچەکانی سنوور بکەوێت پێش راگوێزانیان، تا بتوانن بەرگری هێرشی دوژمن بکەن بۆ سەر نیشتمانەکەیان.

ئەم هێزەی کە بۆ بەجێهێنانی ئەم فرمانە نیشتمانییە پیرۆزە کۆبووەوەو کەوتبووەڕێ بەرەنگاری پیلانێکی ئیمپریالیستی گەورە بوو، کە دەوڵەتەکانی ئێران و عیراق و تورکیاو جاشە دەولییەکانی بەرزانی تێدا بەشدار بوون و لەئەنجامدا ئەو هێزە تێکەڵاوەی کوردستانی عیراق ئەگەرچی بەو پەڕی قارەمانێتی و ئازایەتییەوە بەرگری لەبرسێتی و سەرماو ماندووبوون و پەلاماری دڕندانەی هێزەکانی ئێران، عیراق، عەشیرەتە کۆنەپەرست و دواکەوتووەکانی تورکیاو جاشەکانی (ق.م) کرد، بەڵام لەزنجیرەیەك شەڕدا لە ١-١٩ەی حوزەیراندا لەتورکیا دوای ئەوەی دەیان پێشمەرگەی قارەمان شەهیدبوون و بریندارکران تووشی شکستێکی گەورە بوو.

ئێمە نەبەردییەکمان لەخاکی حکومەتێکی دوژمندا لەدەرەوەی سنووری وڵاتەکەی خۆماندا سەبارەت بەهەڵەو غەڵەتی سیاسی و سوپایی

خۆمان، سەبارەت بەچاك هەڵنەسەنگاندنی پیلانی دوژمنانی شۆڕشەکەمان نەك سەبارەت بەهێزو توانای دوژمنەکانمان دۆڕاند، بەڵام شۆڕشمان نەدۆڕاند، ئێمە نەبەردێکمان لەڕووی سوپاییەوە دۆڕاند، بەڵام نەبەردێکی سیاسی گەورەترمان بردەوە.

-٢-

فەرمانی سەرەکی چەتەکانی بەرزانی کە بەخۆیان ئەڵێن سەرکردایەتی کاتی ((ق.م)) لەماوەی دوو ساڵی رابردوودا بریتی بووە لەلێدانی شۆڕش لەپشتەوەو رێگاگرتن لەهێنانی چەك و تەقەمەنی و کەلوپەل و پەرەپێدانی شۆڕش لەناوچەکانی بادینان، بەپێی پلان و نەخشە (سیا)ی ئەمریکی و (ساواك)ی ئێران و (میت)ی تورکی کە دوژمنی شۆڕشی نوێی گەلەکەمانن و ئەیانەوێت لەپشتەوە لەشۆڕش بدەن، سەرەڕای ئەو هاوکارییە ئاشکرایەی ئەم تاقمە لەگەڵ رژێمی بەغدا کردوویەتی دژی شۆڕش بەوەی کە چەندین کەس و دەستەو تاقمیان بووە بەجاش و چەکیان هەڵگرتووە لەدژی.

(ق.م) بارەگاو شوێنی چالاکی سوپایی لەئێران و تورکیا دایەو بەهاوکاری ساواك و میت و ئیش ئەکەن و لەماوەی پێشوودا زەرەری

گەورەیان لەشۆڕشدا وە بەرکردەوە تاوانبارەکانی خۆیان زیاتر لە
میللەتەکەماندا ریسوا بوون و دوژمنایەتییان دەرکەوتەوە.

دوا تاوانی گەورەو مێژووی ئەم تاقمە ئەوە بوو کە بوون
جێبەجێکەری پیلانی ئیمپریالیزمی ئەمریکی و کۆنەپەرستانی ئێران
تورکی و هێرشێکی گەورەو پڕ تاوانیان بردە سەر ئەو هێزەی پێشمەرگە
کوردستان کە چووبوون بۆ ناو کوردستانی تورکیا بۆ هێنانی چەك
تفاقی جەنگی، بۆ هەڵگیرساندنی گڕی ئاگری شۆڕش لەبادینان.

-٣-

ئەم هێزە جگە لەدژوارییەکانی سروشت وەکو سەرمار سۆڵەو بەفر
ماندووبوونێکی رێگای سەخت و دوور، تووشی پیلانێکی گەورە
ئیمپریالیستی بوو کە رژێمەکانی ئێران و تورکیاو عیراق تیا
بەشداربوون و چلکاوخۆرەکانی بەرزانیش دەوری سەرەنیزەو مقاشیان تیا
بینی.

بێگومان دوژمنان لەم پیلانەدا سوودیان لەهەندێك نوقتەی لاوازی و
کەموکوڕی و هەڵەی سیاسی و سوپایی سەرکردایەتی هێزەکە وەرگرت.

ئەم هێزە چەندجارێك تووشی شەڕ بوو:

لەگەڵ هێزی ئێرانی:

٤/٢٩ تۆپخانەی ئێرانی بۆردومانی بەشێك لەو هێزەی کرد کە بەسنووری عیراق و ئێران (لەناوچەکانی نێوان سەردەشت- قەڵادزە) بەرەو بادینان تێنەپەڕی.

٥/٥ هێزی ئاسمانی ئێرانی لەناوچەی کیلەشین لەسەر سنووری عیراق- ئێران بۆردومانی بەشێکی هێزەکەی کردووە، پێشمەرگەیەکی شەهیدو بریندار کرد.

لەگەڵ هێزی عیراقی

٥/١١ هێزی عیراق لەسالارییە (برادۆست) هێرشی هێنایە سەر هێزەکە، شەڕێکی قورس روویدا لەنێوان هێزی پێشمەرگەو دوژمندا.

چەند سەربازو ئەفسەر کوژران و بریندارکران.

چەند چەکێك دەست پێشمەرگە کەوت.

هێزی ئاسمانی دوژمن هەندێ زەرەری گیانی لەهێزمەکەداو چەند پێشمەرگەیەك شەهیدو بریندار بوون.

٥/١٢ جارێکی کەش هێزی رەگەزپەرستانی عیراق پەلاماری هێزەکەیانداو شەڕێکی سەختی لەگەڵ کرا، زەرەری قورس لەدوژمن درا، هێزی ئاسمانی دوژمن هەندێ زەرەری گیانی لەپێشمەرگەدا.

لەگەڵ هێزی تورکیا

١-١٩/٦ زنجیرەیەك شەڕ لەناو كوردستانی توركیادا لەچەند شوێنێدا لەنێوان هێزی پێشمەرگەی كوردستان و هێزی عەشیرەتە كۆنەپەرست و دواكەوتووەكانی توركیا لەسەر فرمان و راسپاردەی (میت)ی توركی بەهاوكاری لەگەڵ جاشەكانی (ق.م).

-٤-

لەشەڕەكانی ناو توركیا جموجوڵی فراوان و هاوكاری (میت) و ((ق.م))و یارمەتی (ساواك) زۆر ئاشكراو دیاربوو، ئەمانە بەدابەشكردنی پارەو چەك بەسەر هەندێك هێزی عەشایەری دواكەوتوو كۆنەپەرست و ساویلكەی توركیادا توانیان سوود لەم هێزە خێڵەكییانە وەربگرن و بۆ سازكردنی هێرشێكی گەورەو بەرین بۆسەر پێشمەرگەی كوردستان لەژێر دروشمی (سەر بۆ (ق.م) و میت، ماڵ و تاڵان بۆ عەشیرەتەكان)، وە بۆ سەرخستنی پیلانەكەیان زۆر تاوانی ناڕاست و ناوو ناتۆرەو بوختان و درۆی گەورەیان خستبووە پاڵ هێزی پێشمەرگەو شۆڕشی كوردستان.

لەم هێرشەدا دەركەوت كە چۆن داوودەزگا ئیمپریالیستییەكان و حكومەتەكانی ئێران و توركیاو (ق.م)-ی بەكرێگیراو دژی شۆڕش رەفتار

ئەکەن، چونکە بەجولاّنەوەیەکی پێشکەوتنخوازانەی ئەزانن، بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە، وە بەهەموو شوێوەیەك ئەچن بەگژی دا.

بەم جۆرە سەرکردایەتی بەرزانی دوا پەردەی لەسەر دەوری ناجوامێرانەو تاوانبارانەی خۆی لاداو دەری خست کە چۆن بووتە داردەستی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی لەدوژمنایەتی کوردو کوردستان و لێدانی شۆڕەکەی لەپشتەوە بەهەموو شێوەیەك.

دوژمنانی گەل و شۆڕشەکەمان توانیان لەڕووی سوپاییەوە بەم هێرشە زەرەر لەشۆڕش بدەن و دلّی خەلّکی ناوچەکانی سنوور وەکو مێرگە سوور، دەشتی بەرازگر، دۆلّی خواکورك، سیدەکان، گرتگ و روست، سارد بکەنەوە لەچەك هەلّگرتن بۆ شۆڕش و هاتن بۆ ریزی پێشمەرگە گوایە بەخەیالّی خاوی خۆیان باوەڕی گەل بەسەرکەوتنی شۆڕش کەم ئەکەنەوە، بەلاّم لەڕاستیدا ئەگەرچی ئەم پیلانە ئیمپریالیستییەی کۆنەپەرستانی تورکیاو (ق.م) دژی شۆڕش جێبەجێیان کرد، لەڕووی سوپاییەوە سوودی هەبوو، چونکە رێبازی پێشکەوتنخوازی بۆ هەموو لایەك لەناوەوەو دەرەوەی زیاتر روونکردەوە، هەروەکو رووخساری تاوانبارانەیان زیاتر ریسوا کردو بەیەکجاری خستییە ریزی دوژمنانەوە، ئەم راستییەی کە خوێنی دەیان پێشمەرگەی قارەمان لەنرخی ئیسپاتکردنیا دراوە لەهەموو کاتێك زیاتر روون بووەتەوە بۆ جەماوەری گەلەکەمان.

شکستەکەی تورکیا وورەی پێشمەرگەو کۆمەڵانی خەڵکی نەهێنایە خوارێ، بەڵکو زیاتر رق و کینەی تیا ورووژاندن و زیاتر دەماری تۆڵەکردنەوەی شۆڕشگێڕانەی بزواندن، رۆڵە دڵسۆزەکانی کوردستانی عیراق تۆڵەی ئەم شکستەی لەتورکیا بەسەر هێزی پێشمەرگە داهات بەوە کردەوە کە سەدان تێکۆشەر، بەچەکی خۆیانەوە هاتنە ریزی پێشمەرگەوە وە دەیان مەفرەزەی نوێیان دروست کرد لەباڵەك، چۆمان، باڵەیی ئاکویەتی، پشدەر، ئالان سیوەیل، شایر، هەورامان، شارباژێڕ، قەرەداغ وە پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستانیش تۆڵەی ئەو شکستەیان بەزیادکردنی چالاکی شۆڕشگێڕانەو لێدانی هێزەکانی دوژمن کردەوە.

بەراوردکردنی چالاکی و جموجوڵی مەفرەزەکانی پێشمەرگە لەچەند مانگی رابردوودا لەگەڵ جموجوڵ و چالاکییەکانی پێشمەرگە لەهەمان ماوەی ساڵی رابردوودا، دەری ئەخات کە شکستەکەی تورکیا لەباتی ئەوەی وورەیان پێ بەربدات چۆن پاڵی پێوە ناون دەستی کوشندەتر لەدوژمن بوەشێنن.

شەڕی ئێمە، شەڕی جەماوەرە، شەڕی کۆمەڵانی خەڵکە دژی تەفروتونا کردن و راگوێزانی کورد، دژی گۆڕینی روخساری نەتەوەیی کوردستان، لەپێناو مافە دیموکراتییەکانی گەلی عیراقدا، لەپێناو مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورددا، لەبەرئەوە شەڕێکی رەوایە، شەڕی کۆمەڵانی خەڵکە دژی هێزی زۆرداری حکومەتێکی رەگەزپەرستی

فاشستی، شەڕێکی درێژخایەنە، ئەگەرچی دوژمنی پێ لەناو ناچێت لەیەك شەڕدا یەخود لەماوەیەکی کورتدا بەڵام بەشێنەیی وەڕس و هەراسان، بێزارو ماندووی ئەکات سەرەنجام ئەیپسێنێت و چۆکی پێدا ئەدات.

سەیرکردنێکی سادەی دابەشکردنی هێزەکانی دوژمن بەسەر چیاو چۆڵ و دۆڵ و دەرەو گردو زۆرگ و دەشتەکانی کوردستاندا، خەریك کردنی دەیان هەزار سەبازر بەسەنگەرو قایمکاری و سەربازگەوە، خەریککردنی سەدان فرۆکە بەگەڕان بەدوای پێشمەرگەدا، دروستکردنی دەیان ئۆردوگای زۆرەمل بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی گوندەکانی کوردستان، لەسێدارەدانی سەدان نیشتمانپەرری بێ تاوان زیادبوونی ناڕەزایی و رقی گەلی عیراق و توندو تیژبوونی تەنگوچەڵەمە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتییەکانی عیراق، دەرکردنی سەدان ئەفسەری سوپاو گرتن و دوورخستنەوەو هەڵواسینی هەندێکیان.. ئەمانە هەمووی نیشانەی ماندووکردنی رەگەزپەرستەکانی عیراق و گەیشتنی مەرجەکانی پساندیەتی.

هەموو شۆڕشێکی دونیا، هەورازو نشێو، ژێرکەوتن و نۆچ دان و گلان، زەرەرو زیانی تێدایە تا ئەگات بەدوا ئامانجی و بەدوا سەرکەوتن، شۆڕشی کۆمەلانی گەلەکەمان دەرس و پەندی پێویست لەم رووداوانە وەرئەگرێت بەپشتیوانی کۆمەلانی خەلکی تێکۆشەری گەلەکەمان

بناغەی سیاسی و ئایدیۆلۆجی ڕێبازەکەی پتەوتر ئەکات، وە بەدڵنیاییەوە هەنگاو ئەنێت بەرەو بەهێزبوون و گەشەکردن و سەرکەوتن بێ ئەوەی هیچ گیرو گرفت، کەندو کۆسپ، هەورازو نشێو زەرەرو ژێرکەوتن و نۆچ دانێك لەڕێ لای بدات و کۆڵی پێ بدات لەخەبات لەپێناوی بەدیهێنانی دیموکراسی بۆ عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستاندا.

***

# بەڵگەی ژمارە (١)

٩٧٨/٥/١٦

ناوچەی شەمزینان

مەکتەبی سیاسی بەڕێز

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

هیوامان خۆشی و سەرکەوتنتانە

١-ئێمە رۆژی ١٣/٥ گەیشتینە کاك خالیدو ئەوان لەجورجان، دوا
ئەوەی بەئێران و عیراق و بەتابیعەت بەرەنگارمان بوون و هەرد
دەوڵەت بەتەیارەو تۆپ و شەڕ لێیان داین و تەبیعەتیش تەخسیری پ
نەکردین، چوار شەوو چوار رۆژ بەدەوام بەفرو باران و تەم و مژ سەری لێ
تێك داین و لەماوەی (٩) رۆژ پێشمەرگەی ٤-٥ نانی بەرنەکەوت
برسێتی خەڵکەکەی هەژاند، لەبەرئەم هۆیانە واتە شەڕو نەخەوتن و بێ
ئیسراحەتی و برسێتی و سەرما تووشی زۆر گیروگرفت بووین ١
شەهیدەمان هەیەو (٢) رەق بووەمان هەبوو لە کلیلەشین و زیاتر لە
١٥٠ بریندارمان هەبوو بەتەیارەی عیراق لەناوچەی خرینە. (٣٦)
شینەیی و چەند کەسێکی تر گەڕانەوەو زیاتر لە(٢٠) کەسی ترسنۆك و
خوێری و بێ چەك و هەندێ لەوانە چەکداریش خۆیان تەسلیمی عیراق
کردەوەو نزیکەی (٢٦) کەسیش خۆیان تەسلیمی ئێران کردەوە لەوانە

ئەنوەری مەجید سولتان و جەماڵەکەی لای بەکری حاجی سەفەر. باقیەکەی تری هەموو گەیشتنەوەو یەکترمان گرتەوە لەگەڵ کاك خالید، تەنها سەید کاکە لەگەڵ (١٣) پ.م لێمان پچڕاوەو ئەحمەد فەقی رەش لەگەڵ (٣٢) پ.م هێشتا نەگەیشتونەتە لای ئێمە هەرچەندە ئەمانە خەتەریان لەسەر نییەو رەنگە ئەمڕۆ سبەی بگەنەوە لای ئێمە، ئێستا ئەمە سی شەوو رۆژە لەلایە گارەو ماسی روین و ئیسراخەتی باشمان کردووە پێشمەرگەکانمان مەعنەویاتیان بەرز بۆتەوەو وەزعمان باشە. بەڕاستی هێزەکان قاڵ بووە.

هۆمەر ئاغاش لەگەڵ (٦) پ.م دیار نییە ئەڵێن لەگەڵ سەید کاکە یەکیان گرتووەتەوە، هەروەها گوایە ئەحمەدیش گەیشتۆتە سەید کاکە ئەگەر هەموویان پێکەوە بن زۆر باشە، ئێمەش هەر تەعقیببیان ئەکەین، ئەمڕۆش مەفرەزەیەکی ترمان نارد بۆ دۆزینەوەیان.

٢-بەڕەئی من بەیانێك دەرکەن لەسەر ئەو سەخیفی یەی ئێران و عیراق و قارەمانێتی پێشمەرگەکانمان و خۆڕاگرتنیان، ئەمە پیلانێکی زۆر گەورە بوو کرایە سەر شۆڕش و یەکێتی، ئیتر خۆتان ئەمە باشتر ئەزانن.

٣-(ق.م) هەرچەندە هێشتا مەعلوماتی تەواومان لەسەر وەرنەگرتووە، بەڵام تا ئێستا قسە هەر ئەوەیە نێوان خۆیان خراپ و ناکۆکن و

ژمارەشیان بەپێی قسەی خەڵك (٢٥٠) كەس تێ ناپەڕێ لەهەمور ناوچەكە ئەوا خەریكین مەعلومات كۆ ئەكەینەوە.

٤-ئێمە بۆ چەكەكانمان و راپەڕاندنی خەڵكی ناوچەكە بەرەو بادینان ئەچین و جارێ بڕیارمان داوە بێ چەكەكان پڕ بكەین و خۆمان ساز بدەین، نامەمان ناردووە بۆ برایانی پارتی* و كە بەپەلە جێگار شوێنی بكەوێ بۆ تەنسیق كردنی ئیش و كارمان و هەروەها دكتۆر كەمالی خۆشمان بێت بۆ هەمان مەبەست.

٥-ئەوی راست بێت ئێمە هەر لەرۆژی یەكەمەوە كە هاتین دەستمان كرد بەپارە ناردن بەولاو بەم لادا بۆ نان خواردن و نزیكەی (١٠٠٠) دینارمان بلاوكردەوە بەبێ ئەوەی سوودی یەك فیسی لێ بكەین، بۆیە بەپەلە حەسەن نەرمەمان نارد بۆ سوریا كە پارەو كەلوپەلمان بۆ بنێرن بەزوویی و دكتۆریش بێت.

٦-كاك تاهیر بریندار بووە تەیارە پارچەی لەسەر داوە جمجومەی شكاندووە ئەوا خەریكی ناردنین بۆ سوریا بەلام شوكر باشە دڵتان سەغڵەت نەبێ زۆر سەلامەتە، كاك ئەنوەری ئامۆزای و شێخ كامیل بەبرینداری بەجێ ماون.

---

* مەبەست لە(برایانی پارتی) كە ناوی هاتووە (پارتی شۆڕشی میللی كوردستانی توركیایە) واتە هەمان پارتی كە چوارچێوەی قانوونییەكەی بە دە،دە،كا،دە ناسراوە.

٧-بەتێکڕایی وەزعی ناوچەکەو ئێمە زۆر زۆر باشە دڵتان ناڕەحەت نەبێ و گوێ مەدەنە پڕوپاگەندەی دوژمن ئومێدمان وایە بەسەر کەوتووانە هەموو کارەکانی خۆمان ئەنجام ئەدەین و ئاگاداریشتان ئەکەینەوە، تکایە ئێوەش زوو زوو پەیوەندیمان پێوە بکەن بەهۆی کاك نوعمان و برایانی ترەوە.

٨-پێش گەیشتنی ئێمە کاك خالید بەئاراس ناوێکدا نامەی بۆ ناردبوون.

١١ هۆکی تۆکی و ١٢ دەمانچەمان پێگەیشتووە.

ئیتر سەرکەوتووبن

براتان

تاهر عەلی

براتان

خالید سەعید

براتان

عەلی عەسکەری

# بەڵگەی ژمارە (٢)

کوردستان یان نەمان

١٩٧٨/٦/١٠

ناوچەی ژیرکی

بۆ هەڤاڵ مام جەلالی بەڕێز

سلاوێکی شۆڕشگێڕانە

بەهیوای باشی و سەرکەوتنتانین و سلاوو ڕێزمان بۆ کاکە نەوەو کاك د.مەحمودو هەموو برادەران، برادەرانی ئێمە هەموو سلاوو ڕێزیان هەیە.

١-ڕۆژی ٨/١٢ هەردوو ڕەتل بەیەك گەیشتن لەبرادۆست دوای ئەوەی کە ڕەتلی دووەم تووشی هەندێك هیلاکی و نارەحەتی بوون بەهۆی مەوقفی دوژمنانەی ئێرانەوە، وەکو لەنامەیەکی ترا بەڕێزتانمان ئاگادار کرد.

٢-هەر لەهەمان ڕۆژدا دوژمن بەفرۆکە ئینزالی کرد لەسەرمان ئێمەیش بەرەو ماسی رو- گەلیشم کشاینەوە.

٣-دوای چەند ڕۆژێك پشوودان بڕیارماندا کە بەرەو ناوچەی بادینان بکشێین بۆ وەدەستهێنانی چەك و ئیمکانییەت و هەڵگیرساندنی بڵێسەی شۆڕشی پیرۆزمان لەبادینان، لەناوچەی تووەمار (محەمەد حسن)مان بینی و نووسراومان دایە بۆ برادەران کە (٥٠) پەنجا پارچە کلاشنکۆفی بدەنێ

وه جەماعەتی ئامادەکردبوو بۆ چەك هەڵگرتن، وەکو ئاگادارین چەکەکانی وەرگرتووە.

٤-هەر لەماسی رو وە پێش ئەوەی رەتڵی دووەم بگاتە کاك خالیدو کاك شێخ حسین پەیوەندییان بەبرادەرانی (پ.ش.م*)ەوە کردبوو وە ئاگاداریان کردبوو لەپلانی ئەم هاوینەمان و دوای ئەوەش بەئیستمرار هەر پەیوەندیمان لەگەڵیان بووەو نەمان پچڕاندوە، هەرچەندە بێ خێری و بێ هیمەتی ئەوان گەیشتۆتە رادەیەك کە تەحەمول ناکرێت، بەڵام ئێمە هەر نەرم بووین لەگەڵیان.

٥-لە٢٧/٥ لەناوچەی ئورەمارەوە بەرێکەوتین بۆ ناوچەی بازی (؟ ژیرکی) لە ٢٨/٥ گەیشتین و چەند رۆژێك ماینەوە لەئێوارەی ٣١/٥ جەماعەتێك لەچەکدارە کورد کوژەکانی (ق.م) بەدی کران کە بەرەو شوێنەکانی ئێمە ئەهاتن، ئێمەش هەموو شوێنە قایمەکانمان لێ گرتن، هەر لەو شەوە وردە تەقە دەستی پێکردو بەیانی شەڕ گەرم بوو هەتا ئێوارەو رۆژی ١و ٢/٦ بەردەوام شەڕ بوو لەنێوانمانداو هێزەکانمان زۆر نەبەردانە ئەجەنگان و زیانێکی زۆرمان لەو دوو رۆژە لەدوژمندا، بەڵام لەبەر نەشارەزایی و بێ نانی و بێ ئاوی ئێوارەی ٢-٣/٦ بڕیارماندا بکشێینەوە بەرەو کەهی (نزیك هەکاری) وە شەو کە لەچیا هاتینە خوار

* پ.ش.م مەبەست پارتی شۆڕشی میللی واتە هەمان پارتی کە چوارچێوەی ئاشکراکەی دە،دە،دەکا،دە یە.

نزيك گوندی بازی تووشی کەمینێکی جاشەکان بووین و تەقەیان لێ کردین، وەکو بۆمان باسکرِدن ئێمە نەشارەزا بووین و لەو شەوەوە بووین بەدوو قوەتەوەو لەبەکتری بر بووین، ئەمرۆ برادەرانی (پ.ش.م) ئاگاداریان کردین بەنووسراو کەوا کاك عەلی عەسکەری نووسراوی بۆ ئەوان نووسیوە کە بەخۆی و قوەتەکەی لەگەڵیدایە بەرەو (ئەتریس) لەناوچەی عەمادیە چوون و حاڵیان زۆر باشە.

٦-ئێمەش قوەتەکەمان ١٧٠ پێشمەرگەین و قوەتێکی زۆر باشین و برادەران کاك عادل و کاك رەئووف بەگ و کاك شێخ عەلی لەگەڵ قوەتەکەدان و چاوەڕوانی ئەوە ئەکەین کە وەجبەیەك چەکمان بگاتە دەست لەم رۆژانەداو برادەران نزیکیان خستۆتەوە لێمان.

٧-کورد کوژەکانی (ق.م) خۆیان بەژمارە کەم بوون لە ١٥٠ بۆ ٢٠٠ تێ نەئەپەڕین، بەڵام هێزێکی زۆر عەشایەری ناوچەکە لەعەشیرەتی پنیاش و عەشیرەتی ماجد بەك کۆکردووەوەو هێنا بوویان بۆ ئەو شەڕە لەگەڵ گوێی عەشائیری گەردی و زۆری تریش.

٨-خەسائیری ئەوان زیاتر لە ٢٠-٢٥ کوژراویان هەیە لەناو کوژراوەکاندا مەلا ئەمین بارزانی و (٩) کەسی تری بارزانی تیدا بووە کە لەیەکێکیان کوڕی و ئەویتریان برای مەلا ئەمین بووە، وە ٨ کەسمان لێ بەدیل گرتن.

٩-مەجموعەیەك لەئێمە وەكو بیستوومانە تەسلیم بەجاشەكانی (ق.م) بوون تەقدیر ئەكرێن بۆ ٧٠ كەس كە بەشی زۆری بیٚ چەك بوون، وە برسێتی و هیلاكی و نەشارەزایی وای لیٚ كردبوو كە بچنە ناویانەوە.

زیانی ئێمە لەو شەڕانەدا ٥ شەهیدەو ٦ بریندارمان هەیە كە برینەكانیان سووكەو مەترسی لیٚ ناكریٚ، لەناو شەهیدەكانمان دا (شێخ حەمە ئەمین، خەلیفە قادر، شێخ شەهاب خدر مەلا) تیدا بوو لەگەڵ ٢ پێشمەرگەی قادر ئاغا.

١٠ئێستا ئێمە ئیعادەی تنزیمی قوەتەكەی خۆمان كردۆتەوە، وەزعمان باشەو ورەی پێشمەرگەكان زۆر بەرزە؟! ناوچەیەی كە تیداین زۆر هاوكاریمان ئەكەن.

١١-نووسراوی د.كەمال-مان پیٚ گەیشت پێش چەند رۆژێك نووسیبووی كەوا ٩/٦ دێتە لامان، بەڵام ئێستا دەنگی نییە، وا نووسراوەكەی ئەو لەگەڵ كۆمەڵێك نووسراوی كەدا، لەگەڵ ئەم نووسراوەدا بۆمان ناردن.

١٢-لەنووسراوی پێشوودا ئاگادارمان كردن كەوا لەشەڕی ناوچەی لولان كاك تاهیر بریندار بووە، بەڵا م برینەكەی سووكەو ئێستا لەئێمە بزر بووەو متەئەكید نین كەوا لەگەڵ كاك عەلی و قوەتەكەی تردا یان نا؟

١٣-هەر لەناوچەی برادۆست پارەمان لیٚ بڕاوە، زۆری ئەو پێشمەرگانەی دەمانچەیان بووە پێمان فرۆشتوون و پارەكەیمان لیٚ قەرز

کردوون و هەر خەریکی قەرزین و هەندێکیشمان لەبرادەرانی پ.ش.م قەرز کردووە، بەتەمای د.کەمالین کە پارەمان پێ بگەیەنێت وا جاری ئەویش دیار نییە، لەڕووی پارەو فیشەك وەزعمان خراپە.

١٤-ئێمە هەر لەسەر ئیشوکاری خۆمان بەردەوام ئەبین دوای ئەوەی کە ئەو وەجبە چەکەمان دەست کەوت بەرەو بادینان ئەڕۆین کە ئەو ناوچانەدا وەکو ئاگادار کراوین چەکداری خۆمانی نییە (بەیت و الشاب و ئولودەرە).

١٥-ئێمە کە تووشی تەسادم بووین لەگەڵ جاشەکان زیاتر لە ٥٠٠-٧٥٠ عەشائیریان هێنابوو وە هەر بەردەوام بۆیان ئەهات ئێمەش یەك کەسی منتقە لەگەڵمان نەبوو وە کەسێکی شارەزامان نەبوو وە ٣ رۆژ بەبێ نان و ئاو ماینەوە لەچیاو لەشەڕی، فیشەکیشمان بەرەو خەلاس بوون چوو.

١٦-ئێوە ئەکەن خوتان لەناو تورکیا بدەن ئەگەر ویستتان بەرەو بادینان بێن لەسەر حدود وەرن چونکە هەموو ئەو تەقریرو دەنگوباسانەی ئەهاتن هەموو درویە عەشائیر بەشێوەیەکی عام لەناو تورکیا ئێستا لەدژی ئێمەن، وا دیارە موئامەرەکان ئەکری جیهازێکی تایبەتی ئیستعمارییە کە هەر ئەو جیهازە لەناو دەوڵەتی تورکیا تەحریزی عەشائیرو (ق.م) یان لەئێمە کردووە بۆ لەناوبردنی ئێمە پارەیەکی زۆر بەسەر عەشائیر دابەشکراوە بۆ رێگاگرتنی ئێمە.

ئەگەر بۆتان ئەکرێ لەولا لەجاشەکان بدرێ لەناوچەی گەردی زۆر لاواز بێ کەڵك بوون لەو ناوچانە دەریان بکەن.

١٧-تکایە چی هەبوو بەپەلە ئاگادارمان بکەن بەهۆی برادەرانی (پ.ش.م) لەڕێگەی هەکارییەوە.

چی هەبوو لای ئێمە بەکورتی بۆمان نووسین.

ئیتر بۆ پێشەوەو سەرکەوتن

شێخ حسین بابە شێخ

عومەر عەبدوڵلا

د.خالید

## چاپکراوەکانی کتێبخانەی شەهید جەمالی عەلی باپیر

١ ژیان و نهێنیەکانی نەوشیروان مستەفا بەرگی یەك و دو

٢ مفەوەزاتی بەرەی کوردستانی بەعس نوسینی نەوشیروان مستەفا

٣ خەون یان مۆتەکە یاداشتی ڕۆژانەی شەڕی ناوخۆ نوسینی نەوشیروان مستەفا

٤ یاداشتەکانم لە مەجلیسی حکوم دا نوسینی نەوشیروان مستەفا

٥ لەهاوخەباتیەوە بۆ تەخوین نوسینی نەوشیروان مستەفا

٦ پەنجەکانی نەوشیروان خەباتی هاوڕکانی دەشێوێنێت نوسینی کۆسرەت ڕەسول عەلی

٧ درۆ و دراو دیدارە ڕۆژنامەوانیەکانی نەوشیروان مستەفا

٨ کتێبێك لە دژی دەسەلات نوسینی نەبەز گۆران

٩ سۆفی و سۆفی گەرێتی نوسینی لەتیف هەلمەت

١٠ غەزەلی مەزن بەشێك لە شیعرەکانی ئەحمەدی شاملۆ

١١ ژیان و نهێنیەکانی مەسعود بارزانی

١٢ کوردستان و بزوتنەوەی کورد نوسینی مام جەلال

<u>تێبینی</u>

ئەو دو کتێبەی نەبەز گۆران و لەتیف هەلمەت ئۆگۆی کتێبخانەکەمانی لەسەرنیە!